ئەفلاتون




# Apology

## داکۆکیکردنەکەی سۆکرات لە دادگادا

وەرگێڕانی بۆ ئینگلیزی

بنیامین جۆوێت

وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە

ئاوات ئەحمەد

سلێمانی ٢٠٠٢

## پێشەکی

١. لــــەماوەی نێـــــوان ٢٢/٧/٢٠٠١ – ٩/٨/٢٠٠٢دا، لەزانکۆی سلێمانی ئامادەی کۆرسێکی فەلسەفیی تایبەت بە ئەفلاتون بووم، کە لەلایەن ماموٚستای بەڕێز فاروق رەفیقەوە بەڕێوە دەبرا. ئەو کۆرسە تەسەوری منی بەرامبەری ئەفلاتون گۆڕی و گەلێك هەڵەی لەبۆچوونەکانمدا راست کردەوە. کۆرسێکی کورتخایەن، بەڵام پڕ سوود بوو.

یەکێك لەو بابەتانەی لەو کۆرسەدا تیشکی خرایە سەر، ئەمەیە کەئێستا لەبەردەستی خوێنەردایە. دکتۆر فاروق لەکۆرسەکەدا بە ( عوزرخواهی ) ناوی دەبرد، دیارە دکتۆر زیاتر مەبەستی روونکردنەوەی بابەتەکەو دەرخستنی لایەنە شاراوەکانی بووە، نەك گەڕان بەدوای ناوێکی شایستەدا بۆ داکۆکیکردنە فەلسەفییەکەی سۆکرات لەبەردەمی لیژنەی دادوەرانی ئەسینادا. دوای

گەران و پشکنینیکی زۆر، گەیشتمە ئەوەی نـاوی بنیـم پـۆزش، گـەرچی هـەردوو ناونیشـانەکە، واتـە پـۆزش و عـوزر خواهــی و تەنانــەت ناونیشــانە ئینگلیزییەکــەش (apology) بۆنیکـــــی پەشـــــیمانبوونەوەو لیبـــــوردن خواستنیان لیدیت، بەڵام وەك واتر خوینەر خۆی دەرکـی پیدەکات، سۆکرات نەك هەر لـەکردەی خـۆی پەشـیمان نـەبووەو داوای بەخشـینی نـەکردووە، بــەلکو بەوپــەری سەرســەختییەوە داکۆکیــی لـــەخۆی کــردووەو بــەهیچ جۆریــك سازشــی نــەکردووە، بگــرە لەوانەیــە شــیوازی ســـەخت و رەقـــی قســـەکردنەکەی بووبیـــتە هـــۆی بریندارکردنــی، ژمارەیــەك لەئــەندامانی ئەنجومەنەکــەو ئەگــەر پیشــتریش ســۆزیکیان بەرامبــەری هــەبووبیت، نــەیانمابیت. کــەچی ئــەوەی جیــی ســەرنجە، ژمــارەی ئەوانەی تاوانباریان کرد، زۆر نزیکە لەژمارەی ئەوانـەوە کە تەبرییەیان کـردووە، سـۆکرات خۆشـی سـەری لـەوە سور دەمینیت و بەبردنەوەیەکی دادەنیت بۆ خـۆی دژی میلیتۆس.

لەورگیرانی پۆزش یان عوزرخواهیدا، دوو تیکستمان لەبەردەمدا بووە کە بریتین لە:

**1-Man and Man**
**The social philosopers**
**Editd by Saxe Commins & Robert N. Linscott**
**Pp 184-211**



**1947.**
**2-Apology**
**Translated by: Benfamin Jowett**

**ئەم سەرچاوەیەمان لەئینتەرنێتەوە وەرگرتووەو بەشێوەیەکی سەرەکی پشتمان پێبەستووەو تەنیا لەوشوێنانەدا گەڕاوینەتەوە بۆ سەرچاوەی یەکەم کەهەستمان بە تەژمی و ئالۆزی کردووە. دواجار هەردوو تێکستەکەمان بەرامبەری یەك گرتووەو وەرگێڕانە کوردییەکەمان مشتومالٚ کردووەو ئەمەی لێدەرچووە کەلەبەردەستی خوێنەردایە. شایانی باسە کەلەکاتی کۆرسەکەدا دکتۆر فاروق وەرگێڕانێکی ئینگلیزیی تازەی لەبەردەستدا بوو، کە لەکۆتایی هەشتاکاندا چاپکرابوو، روومان لێنا بۆمان جێبهێڵێت، بەلاّم ئەو نەیتوانی دەسبەرداری ببێت و لەگەڵ خۆیدا بردیەوە بۆ کەنەدا.**



## ٢. وتەیەك دەربارەی وەرگێڕی ئینگلیزیی

بینجـامین جۆویـت (1817-93) Jowett, Benjamin ڕۆشـنبیرو لێکۆڵـەرێکی بەریتانییـە کەپسـپۆڕ بـووە لەلێکۆڵینـەوەی کـەلتوری یۆنـانیدا. لـەکامریدج لـەدایك بووەو خوێندنـی لـەزانکۆی ئۆکسـفۆرد تـەواو کـردووە. لەسـاڵی ١٨٤٢دا، لەکەنیسـەی ئینگلـیزییدا، دەبێـت بەقەشە. هەروەها لەساڵی ١٨٥٥دا لەزانکۆی ئۆکسفۆرد وەکو پرۆفیسۆری یۆنانیی دەسبەکار دەبێت. لە هەمان سـاڵدا نامەکـەی سـانت پـۆڵ وەردەگـێڕێت بـۆ زمـانی ئینگلـیزیی و مشـتومڕو بێنەوبەرەیـەکی زۆری لێدەکەوێتـەوە، چونکـە ئـەوکارە خـۆی لـەخۆیدا لێکدانەوەیـەکی لیبراڵانـەی نامەکـەی سـانت پۆڵیشـی گرتبـووە خـۆی، کێشـەکە تەشـەنەی کـردو لەسـاڵی ١٨٦٠دا تۆمـەتی هەرتەقە درایـە پـاڵی، بـەڵام سـەرۆکی دادگـای ئۆکسـفۆرد لـەو تۆمەتـە ئـازادی کـرد. لەسـاڵی ١٨٧٠دا بـوو بەسـەرۆکی کۆلیـژی بـالیۆل لـەزانکۆی



ئۆكسفۆردو هەتا مردنی لەم پۆستەدا مایەوە. هەروەها لەماوەی نیوان سالآنی ١٨٨٢- ١٨٨٦ یاریدەدەری سەرۆكی زانكۆی ئۆكسفۆرد بووە. وەك پیاویكی رۆشنبیر گەلیك چاككاری لەسیستمی خویندنی زانكۆییدا كردووەو خزمەتیكی زۆری خویندكارەكانی كردووە. نیودارترین كاری جۆویت بریتیە لەوەرگیرانی دیالۆگەكانی ئەفلاتون لەچوار بەرگدا و لەسالی ١٨٧١دا یەكەمین چاپی بلاو دەكریتەوە. هەروەها كاری چەند بیریاریكی دیكەی یۆنانیشی وەرگیراوە، كەدیارترینیان میژووی پیلۆپۆنیشیان ( دوو بەرگ . ١٨٨١) كەنوسراوی سیۆسیدیدیسە، هەروەها سیاسەتەكەی ئەرەستۆ ( دووبەرگ . ١٨٨٥)، هەروەها كۆمارەكەی ئەفلاتون ( سێ بەرگ . ١٨٩٤).

**Encarta Encyclopediaa 2001**

**وەرگیری كوردی**

**سەرەتای مارتی ٢٠٠٢**



17a ئۆ ئەسینایییەکان، تاوانبارکەرانی من چۆن توانییان کارتان تێبکەن، ئەمەیان نازانم، بەڵام دەزانم کەئەوان بەشێوەیەکی ئەوەندە قایلکەرانە دووان، تارادەیەکی زۆر وایان لێکردم خۆشم بیرم بچێتەوە کەمن کێم، وەلی لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەدەگمەن وشەیەکی ڕاستیان درکاند. لەناو ئەو هەموو درۆیانەدا کەئەوان کردیان، درۆیەکیان زۆر سەرسامی کردم، مەبەستم لەوەیە کەوتیان پێویستە ئێوە وریای خۆتان بن و ڕێ بەخۆتان نەدەن زمانپاراوییەکەی من لەخشتەتان ببات. ئەوان بۆیە وایان وت، چونکە دڵنیابوون لەوەی هەرئەوەندەی من دەمم کردەوەو سەلماندم کە ڕێی تێدەچێت هەرشتێك بم، بەڵام قسەکەرێکی باش نیم 17b یەکسەر تێدەکەون، بەڕاست پێموایە ئەمە شتێکی زۆر بێشەرمانەیە، مەگەر ئەوان مەبەستیان لەهێزی زمانپاراویی هێزی ڕاستیی بێت، ئەگەر ئەمە مەبەستەکەی ئەوان بێت، ئەوا من پێی لێدەنێم کەزمانم پاراوە. بەڵام بەرێگایەکی یەکجار جیاواز لەوەی ئەوان! یانی، وەکو وتم، ئەوان بەدەگمەن قسەی ڕاستیان کرد،



بـەڵام، ئیـــوە لەمنـــەوە هـــەموو راســـتییەکە دەبیســـتن: بەهـەرحاڵ وەکـو قسـەکانی ئـەوان. سـویندم بـەئاسمان، نەخیر! بـەڵام مـن ئـەو وشـەو گوزارشـتانە بـەکاردەهینم کەهەرئیســـتا بـــەدەممدا دیـــن، چونکـــە مـــن دلنیـــام لەدادپـــەروەریی مەســـەلەکەی خـــۆم. ئـــۆ پیـــاوانی ئەسینا،من لەماوەی ژیانی خۆمدا، هەولمداوە لەبەردەمی ئیـوەدا، 17c هـەرگیز وەکـو وتـاربیژیکی هـەرزەگۆ دەرنەکەوم.. با کەس چاوەریی ئەوەم لی نەکات. هەروەها پیویسـتە داواتـان لیبکـەم چاکەیـەکم لەگـەلدا بکـەن: ئەگـەر مـن بـەو شـیوازە داکۆکییـم لـەخۆم کـرد کـەپیی راهاتووم، هەروەها ئیوەش گویتان لیم بوو، هـەمان ئـەو وشـانە بـەکاردەهینم کـەخووم پیـوە گرتـووە لـەئاگۆرا* بەکاریان بهینم، لەسـەر مـیزی پـارە گۆرەرەوەکـان، یـان

* ئاگۆرا Agora بازاریکی میللی بووە لەهەرشاریکی یۆنـانی دیرینـدا، لەئەسلدا شوینی ئەنجومەنی گشـتی بـووە، بـەڵام بەتیپـەرینی کـات بووە بە شوینی بازرگانی. شـوینیکی فراوانـی کـراوە بـووەو چوونـە نـاوی ئاسـان بـووە، بـووە بەسـەنتەری ژیـانی سیاسـی، بازرگـانی، ئـاینی، کۆمەلایـەتی لەشـارەکەدا. چـواردەوری ئـاگۆرا بـە بینـاو پەرستگاو دامەزراوە میللییەکان گیراوە. نیودارتریـن ئـاگۆرا ئـەوەی ئەسینا بووە. شایانی باسە کـە هـەموو پـەراویزەکانی ئـەم تیکسـتە لەلایەنی وەرگیری کوردییەوە ئامادە کراوە.



**لەهەر شوێنیکی تر بەکاریان بهێنم، داواتان لیدەکەم سەرتان نەسورمێنیت و، لەبەرئەم هۆیە قسەکانم پێ نەبرن. چونکە من تەمەنم لەحەفتا ساڵ تیپەری کردووەو، ئەمەش یەکەمین جارمە لەبەردەمی یاسادا ئامادە دەبم، 17d من بەتەواویی بەزمانی ئەم شوینە نامۆم، هەربۆیە داواتان لیدەکەم وەك نامۆیەك مامەلەم لەگەلدا بکەن، دیارە ئێوە لەنامۆیەك دەبورن ئەگەر بەزمانی سروشتیی خۆی بدویت وشیوازی شارەکەی• خۆی بەکاربهێنیت 18a ئایا من داوای شتیکی نادادپەروەرانەتان لیدەکەم؟ خۆ شیوازەکە گرنگ نیە، کەرەنگە یان رەنگ نیە باش بیت، بەلکو تەنیا بیر لەراستیی وشەکانم بکەنەوەو، بایەخ بەوە بدەن: لیگەرین**

---

• هاوینی سالی ٢٠٠١ وەرگێری ئەم باسە ئامادەی کۆرسیکی فەلسەفیی بوو کە تایبەت بوو بەئەفلاتون و بەریز دکتۆر فاروق رەفیق سازی کردبوو. دکتۆر لەو کۆرەدا رای وابوو کە لەتیکستەکانی ئەفلاتوندا وشەی ولآت بەدیی ناکریت و بەتەنیا زاراوەی شار بەکار هاتووە، ولآت وشەیەکی تازەترەو پەیوەندیی بە مۆدرینیزمەوە هەیە. بۆیە ئیمەش لیرەدا پیرەویی لەبۆچوونەکەی ئەو دەکەین، گەرچی وەرگێری تیکستە ئینگلیزییەکە وشەی (country) داناوە کەمانای ولآت دەگەیەنیت.



با قسەکەرەکە قسەی راست بکات، هەروەها دادوەریش دادپەروەرانە بریار بدات.

سەرەتا، پیویستە وەلامی تۆمەتە دیرینترەکەو تاوانبارکەرەکانی سەرەتام 18b بدەمەوە، پاشان دیمە سەر ئەوانەی دواتر. بۆ کۆنەکەیان، تاوانبارکەرم زۆرە، ئەوانەی لەماوەی سالانیکی دریژدا، بەدرۆو فیشال لای ئیوە تاوانباریان کردووم، بۆیە من زیاتر لەوان دەترسم، نەك ئانیتۆس• و هاوریکانی، کەئەمانیش بەشی خۆیان مەترسییان هەر هەیە. بەلام ئەوەی مەترسیدارترە، ئەوانەی ترن، کەلەکاتیکدا دەستیان پیکردووە ئیوە مندال بوون و درۆو دەلەسەکانیان میشکی هەمووتانی پرکردووە، دەلین سۆکراتی دانا، لەئاسمانی سەرەوە راماوە، هەروەها لەزەوی خوارەوەشی کۆلیوەتەوە،

18cوایکردووە خراپترین وەك باشترین دەربکەویت. ئەوانەی ئەم قسەلۆکانە بلاو دەکەنەوە، ئەو تاوانبارکەرانەن کەمن لییان تۆقیووم، چونکە ئەوان، بیستەرەکانی خۆیان، توشی وەهمیك دەکەن، بەوەی ئەم

---

• ئانیتۆس Anytos کۆتایی سەدەی پینجەمی پیش زایین و سەرەتای سەدەی چوارەمی پیش زایین سیاسەتمەداریکی ئەسینییە، سەربەدیموکراتەکان بووە.

**چەشنە خەلکانەی ئاوا پرسیار دەگەن، باوەریان بەبوونی خوداکان• نیە. هەروەها ئەوان زۆریشن، تۆمەتەکەشیان دژی من هەر لەرۆژانی زووەوەیە، لەرۆژانیکدا کەئیوە منداڵ بوون یان لەوانەیە هەرزەکار بووبن، زۆر لەئیستا باشتر کارتان تیدەکرا.. ئەوکاتە تۆمەتەکە بەرگوێ کەوت و پشتگوێ خرا، چونکە کەسیك نەبوو وەڵامی بداتەوە. لەهەمووشی ناخۆشتر، 18d من ناوی تاوانبارکەرانم نازانم و ناتوانم ناویان بینم، مەگەر لەشیعریکی کۆمیدیدا ناوەکانیان هەبیت. هەموو ئەوانەی بەهۆی رق و ئیرەییەوە ئیوەیان قایل کردووە .. هەندیکیان پیشتر خۆشیان قایل کردبوو .. هەموو ئەم چەشنە پیاوانە، مامەلەکردن لەگەلیاندا زەحمەتە، چونکە من ناتوانم**

---

• **خوداوەند god** کورتکراوەی خودایە، کە مانای یەزدان دەگەیەنیت، لیرەدا وشەی خوداوەند بەو مانایە بەکارهاتووە کە گوزارشت لە چەند پەرستراویکی بچووکتر بکات ( ماتریالیی بن یاخود میتافیزیایی ، کە هەموویان پیکەوە دەوری خودا یان یەزدان ببینن، کە ئەمەیان خەسلەتی ئاینە فرە یەزدانەکانە. راستییەکەی لە زمانی کوردیدا، خوداوەند و خودا هەر بەهەمان مانا بەکار دەهینرین، لیرەدا چارمان نەبوو بۆ جیاکردنەوەیان لەیەکتریی، چونکە زاراوەی بت یان سەنەم مانای تەواوی زاراوەکە نادەن بەدەستەوە.



بیانهینمــه ئــیرەو بیانهینمــه قســـه، بۆیـــه دەبیـــت لەداکۆکیکردنەکــەمدا، بەشــیوەیەکی ســاکارانە لەگــەڵ تارماییەکاندا بجەنگیم، پرسیار بکەم و کەسیش نەبیت وەڵامم بداتەوە.

18e بۆیە داوا لەئیوە دەکەم لەگەلمدا گریمانەی ئەوە بکەن، هەروەکو پیشتر وتم، کەدژەکانی من دوو جۆرن، یەکیکیان تازەیەو ئەویتریشیان کۆنە: هەروەها بەهیوام ئیوە ئامادەبوونی من ببینن بۆ ئەوەی یەکەمجار وەڵامی کۆنەکان بدەمەوە، دەربارەی ئەو تۆمەتانەی کەئیوە زۆر لەپیش ئەوانترەوەو چەند جاریکیش گویتان لیبووە.

19a کەواتە، ئیستا پیویستە داکۆکی لەخۆم بکەم، هەوڵ بدەم بەماوەیەکی کەم ئەو بوختانانە برەوینمەوە کەماوەیەکی دوورودریژە بڵاوبوونەتەوە. بلییی لەمەدا سەرکەوتوو ببم، ئەگەر سەرکەوتن بۆ منیش و بۆ ئیوەش باش بیت، یان لەمەسەلەکەمدا سودیکم پیٚ بگەیەنیت! ئەم ئەرکە شتیکی ئاسان نیە، من بەتەواویی لەسروشتی ئەم ئەرکە تیدەگەم. بۆیە مەسەلەکە بۆ خودا• جیدەهیلم،

---

• جیی سەرنجە کە لیرەدا وشەی خودا بەپیتی گەورە نوسراوە، واتە (God) کەئەمیان لەزمانی ئینگلیزیدا مانای ئەو خودایە دەگەیەنیت کە ئاینە یەکتا پەرستەکان باوەریان پییەتی.. یاخود لەوانەیە



ئیستا بەس بۆ ئەوەی گویرایەلی یاسا ببم، داکۆکیی لەخۆم دەکەم.

من لەسەرەتاوە دەست پیدەکەم، دەپرسم ئەو تۆمەتە کامەیە، کە خراوەتە ئەستۆی من، کە 19b میلیتۆسی• هانداوە دژی من هەلیببزیریت. باشە، بوختانەکان چی دەلین؟ ئەوان شایەتن بەسەرمەوەو، منیش شکاتەکەیان کورت دەکەمەوە:" سۆکرات خراپەکارە، کەسیکی کریسە•، لەژیر زەوی و لەئاسماندا بەدوای شتەکاندا دەگەریت، بەرگی چاکە دەکاتە بەری خراپە، ئەو ئەم پیرەوەی پیشتر باسکرا، فیری خەلکانی تریشی دەکات، سروشتی تۆمەتەکە ئەمەیە:

---

سۆکرات مەبەستی لەخودایەکی تایبەتی بیت بەخۆی، کە لەرەوتی داکۆکیکردنەکەدا ئەم شیمانیەیان زیاتر ریی تیدەچیت

• میلیتۆس (Meletus) شاعیریکی تراجیدیی یۆنانییە.

• کریس بەمانای فزولیی (curious) دیت، واتە ئەوکەسەی کەزۆر خۆی لەشت هەلدەقورتینیت و پرسیاری زۆر دەکات، کە لەراستیدا ئەمە دیارترین خەسلەتی سۆکرات بووە.



**19c ئەوەیە کەخۆتان لەکۆمیدیاکــەی ئەریســتۆفاندا بینیوتانە•، باسی پیاویك دەکات کەناوی ناوە سۆکرات، دەلیـت بـەئاسماندا دەروات و دەربــارەی چــەند شــتیك قسـەی هەلـەق و مەلـەق دەکات کـەمن لافی ئـەوە لینـادەم بیانزانم، نەزۆرو نەکەم.. من نامەویت بەمە خراپـە لەگـەڵ هیـچ یـەکیك لەوانــەدا بکــەم کەلەفەلســەفەی سروشــتی دەکۆلنـەوە•. زۆرم پـیٚ نـاخۆش دەبیــت ئەگــەر میلیتــۆس**

---

• ئەریسـتۆفان ,Aristophanes (448?-385 BC) شانۆنامەنوســیکی نیـوداری یۆنانییـە، بەیـەکیك لەهەرەمــەزنترینی کۆمیدیانوســەکانی میژوو لەقەلەم دەدریت. شانۆنامەکانی بەدریژایی سەدەکان نماییش کراون و هەتا ئیستاش تام و چیـژی هۆیـان مـاوە، لەبـەر ئـەو بـیرە کۆمیدیـی و زرنگانـەی تییـاندا دەبیـنرین و هــەروەها لەبــەر زمانــە شیعرییەکەشی. زیاتر لە ٤٠ شانۆنامەی نوسـیوەو یازدەدانـەیان بـۆ ئیمە ماوەنەتەوە. ئــەوەی لـیرەدا مەبەسـتمانە شـانۆیی هەورەکانـە Clouds (423 BC) کەبەشیوەیەکی گالتەجارانە باسی سۆکرات دەکات وای پیشـان دەدات کـە بیروبۆچوونـەکانی سـۆکرات لەبــەرژەوەندیی شارەکەدا نیە.

• سروشـــــتی ، فەلســــەفە Naturalism (philosophy) بریتیــــە لەجولاٌنەوەیەکی فەلسەفیی جەخت لەوە دەکات کەدەتوانریت لەریی لیکۆلینەوەی زانستییەوە بەتەواویی لەسروشت تیبگەین، ئەم رەوتە فەلسەفییە نکولیی لەهەموو بوونیکـی رۆحیـی و میتافیزیـا دەکـات،

**بتوانیت ئەم تاوانە مەترسیدارە بداتە پالی من. بەڵام راستییە سادەکە ئەوەیە، ئۆ ئەسینایییەکان، کەمن هیچ کاریکم بەتیرامانی سروشتی نیە.**

**19dزۆربەی زۆری ئەوانەی لیرەدا ئامادەن شایەتی راستیی ئەم قسەیەن، من ئەوان دەکەم بەناوبژیکەر. کەواتە ئەی ئەوانەی گویتان لەمن بووە، قسە بکەن، لەدراوسیکانتان بپرسن ئایا هیچ یەکیك لەئیوە بیستویەتی من کەم تازۆر باسی ئەم چەشنە مەسەلانە بکەم.. گویتان لەوەڵامەکانیانە*، لەوەی ئەوان دەربارەی ئەم بەشەی تۆمەتەکە دەیلین، ئیوە دەتوانن لەراستیی بەشەکانی تریشیدا دادوەریی بکەن.**

**وەك وەڵامیکی بچووك بۆ ئەو کەسەی دەلیت گوایە من مامۆستام و، کریَ وەردەگرم، ئەم تۆمەتەشیان لەوەی پیشوو زیاتر راستی تیدا نیە. ئەگەرچی بەبروای من، 19e ئەگەر پیاویك بەراستی بتوانیت وانە بەمرۆڤ**

---

پیی وایە کە یاسای هۆو ئەنجام راڤەکەری هەموو دیاردەکانەو لەدەرەوەی ئەم یاسایە هیچ یاسایەکی تر کاریگەرییەکی واقیعییانەی نیە.

* دیارە لیرەدا بەشیك لەوانەی کە ئامادەی دادگاییەکە بوون وەکو بینەر، وەڵامی پرسیارەکەی سۆکرات دەدەنەوەو ئەویش سەرنجی دادوەرەکانی بۆ رادەکیشیت.



**بليتەوە، كريش بەرامبەرى وانەوتنەوەكەى وەربگريت، ئەوە شكۆمەنديى و سەربەرزييە بۆى. ئەوە گۆرگياسى ليۆنتينى• و، پرۆديكۆسى كييۆس• و، هيپپياسى ئەليزيى•، كەبەشارەكاندا دەگەرين و، لەتوانياندا هەيە پياوانى لاو قايل بكەن تا دەسبەردارى**

---

• گۆرگياس ,Gorgias (circa 485-c. 380 BC) رەوانبيژو سۆفيست و فەيلەسوفيكى يۆنانييە، لەشارى ليۆنتينى لەدايك بووە لەسيسيلى. لەسالى ٤٢٧ى پيش زاييندا، باليۆزى ئەسينا بووە. دواتر لەئەسينا نيشتەجێ بووەو وانەى رەوانبيژيى وتۆتەوە. گۆرگياس يەكيكە لەوانەى كە بۆ يەكەمينجار كيش و ئيقاعيان لەپەخشاندا بەكارهيناوە. گۆرگياس ناونيشانى دەمەتەقييەكى ترى ئەفلاتونيشە، كە ئيستا ئيمە كارى تيدا دەكەين بۆ ئەوەى بيكەين بەكوردى. فەلسەفەكەى گۆرياس نەهليستى بووە. لەتەمەنى ١٠٥ ساڵييدا لەشارى سيساليا مردووە.

• پرۆديكۆس (Prodicus) سەدەى پينجەمى پيش زايين، يەكيكە لەفەيلەسوفە سۆفسيستەكانى يۆنان، خەلكى كيۆسە.

• هيپپياس Hippias لەدەوروبەرى سالى ٤٩٠ى پيش زاييندا مردووە، ستەمكارى ئەسينايە، لەدواى سالى ٥٢٧ى پيش زايينەوە، بەردەوام بوو لەسەر سياسەتەكەى پيسيستراتيۆسى باوكى. لەسالى ٥١٠دا لەسەر تەخت لابراو دوورخرايەوەو، دواتر لەدادگاى فارسەكاندا دەسبەكاربووەو لەكاتى ماراسۆندا، راويژكارى فارسەكان بووە.



**20a هاوشارییەکانی خۆیان بن، چونکە هیچیان لیوە فیر نابن، دین بۆلای ئەمان و نەك تەنیا کریشیان دەدەنێ، بەلکو سوپاسگوزاریشیان دەبن. ئالەم کاتەدا، فەیلەسوفیکی خەلکی پارا لەئەسینا نیشتەجێ بووە، کاتیك بەرەو ئیرەوە بەریوە بووم، بیستم.. ئەوەم لەپیاویکەوە بیست دنیایەك پارەی لەسۆفیستەکاندا•**

---

• سۆفسیستەکان Sophists بەزاراوەی یۆنایی سۆفیست وە هاتووە کەماناکی شارەزا یاخود پسپۆر یان پیاوی دانا دەگەیەنیت. گریکەکان لەسەرەتادا ئەم زاراوەیەیان بەکارهیناوە بۆ پیاوانیك کە فیربوون و تیگەیشتوون، وەکو حەوت پیاوە داناکەی یۆنان، لەسەدەی پینجەمی پیش زایندا ئەم زاراوەیە بۆ ئەو مامۆستا گەرۆکانە بەکاردەهینرا کە لەبەرامبەری کرییەکدا لەشەش حەوت لقی بالآی زانیندا دەرسیان دەووتەوەو زیاتر بەشیوەیەکی سەربەخۆ کاریان دەکرد نەك وەکو قوتابخانەیەك یان گرووپیك. سۆفیستەکان بیرو بۆچوون و ئایدیاکانی فەیلەسوفەکانی سەرەدەمی خۆیان و پیشتریشیان ئاسان دەکردەوەو مۆرکیکی جەماوەرییانەیان پیدەبەخشین. سۆفیستەکان هاوکات لەگەلّ سۆکرات و ئەفلاتون و ئەرستۆشدا لەئەسینادا شۆرەتیان پەیدا کردووەو دژایەنییەکی فەلسەفیی و ململانییەکی سەخت لەتیوانی ئەم سیانەو سۆفیستەکاندا هەبووەو لەنوسینەکانی ئەم سێ فەیلەسوفەدا بەتەواویی رەنگی داوەتەوە. دیارترینی سۆفیستەکان

**ســـەرف کردبـــوو، ئـــەو پیـــاوەش کالیاســـی کـــوڕی هیپۆنیکۆس بوو. من دەمزانی کالیاس دوو کوڕی هەیە، لیم پرسی: کالیاس، ئەگەر دووکوڕەکەی تۆ دوو جوانوو بوونایە، یـاخود دوو گویرەکـە بوونایـە، هیـچ گرانییـەك لـەوەدا نـەدەبوو یـەکیك بدۆزیتـەوە بایـەخیان پیبـدات، ڕاهینـەریکی ئەسـپمان بـەکرێ دەگرت، یـاخود لەوانـەبوو جوتیاریکمـان بـەکرێ بگرتایـە، کەمەشـقی پیدەکـردن و بەرەو چاکیی و لیهاتوویی خۆیانی دەبردن،**

**20b بـەڵام مـادام ئـەوان مرۆڤن، بیر لـەکێ دەکەیتـەوە سەرپەرشـتییان بکـات؟ کـــەس هەیـــە لـــەمرۆڤیش و فەزیلەتی سیاسییش تیبگات؟ دەبێ بیرت لـەم مەسـەلەیە کردبیتەوە، چونکە تۆ کـوڕت هەیـە، کـەس هەیـە؟. وتـی: هەیـە. وتم: کییـە؟ خـەلکی کوییـە؟ کریکـەی چـەندە؟ وەڵامی دامەوە:**

**20c ئەو پیـاوە ئیڤینۆسـی پارییـە، کریکەشـی پینـج مینایـە. بـەخۆمم وت" ئیڤینۆسـی پیـاویکی بەختـەوەرە، ئەگەر بەراستی ئەم داناییەی هـەبیت و، بـەم کرییـە کەمـە فیری خەلکی بکات. ئەگـەر من ئـەوەم هەبوایـە، ئـەوا زۆر**

---

پرۆتاگۆراس، گۆرگیاس، هیپیاسی ئـەلیزیی، هـەروەها پرۆدیکۆسـی کایۆسیی بوون.



شانازییم بەخۆمەوە دەکردو لەخۆم بایی دەبووم، بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کەمن هیچ زانیارییەکی لەو چەشنەم نیە.

ئەسینییەکان، دەویرم بلیم، ڕەنگە یەکیك لەناو ئیوەدا وەڵامم بداتەوە، بەڵێ سۆکرات، بەڵام ئەسلی ئەم تۆمەتەی کەرووبەرووی تۆکراوەتەوە، لەکویوە هاتووە، دەبێ تۆ شتیکی نامۆت کردبیت؟ ئەگەر تۆ وەکو پیاوانی تر وابوویتایە، ئەوا ئەم پروپاگەندەو قسەلۆکانەی دەربارەت دەکرین، هەرگیز دەرنەدەکەوتن: کەواتە، پیمان بلێ، هۆی ئەمانە چییە، چونکە ئیمە زۆر پەشیمان دەبین ئەگەر بەپەلە حوکمت بەسەردا بدەین،

20d من ئەمە بەتەحەدایەیەکی نەرم و نیان دادەنیم، هەولیش دەدەم هۆی ئەوەتان بۆ روون بکەمەوە کەبۆچی من بەدانا لەقەلەم دراوم و ئەم شۆرەتە خراپەم لەکویوە بۆ هاتووە. 20e کەواتە، تکایە گوی رادیرن. هەروەها ڕەنگە هەندیك لەئیوە وابیر بکەنەوە کەمن بەگالتەمە، من پیتان رادەگەیەنم کەراستییە پوختەکەتان پیدەلیم. پیاوانی ئەسینا، ئەم شۆرەتەی من لەچەشنیك داناییەوە هاتووە کەمن هەمە. ئەگەر لیم بپرسن چ چەشنە داناییەك، وەڵام دەدەمەوە داناییەك کەمرۆڤ دەتوانیت بەدەستی بهینیت، 20eمن تائەم مەودایە دەتوانم بلیم

**لەوباوەڕەدام کەدانام، بەڵام ئەوکەسانەی کەدەربارەیان دەدوام، ئەوانە داناییەکی ژوور مرۆییان هەیە کەرەنگە نەتوانم وەسفی بکەم، چونکە من خۆم ئەوەم نیە، هەروەها ئەوەی دەڵیت سۆکرات ئەو چەشنە داناییەی هەیە، ئەوە بەهەڵەدا دەچیت و، لەکەسیتی من دوور دەکەویتەوە. لیرەشدا، ئۆ، پیاوانی ئەسینا، پیویستە داواتان لیبکەم قسەم پی نەبرن، تەنانەت ئەگەر وادیاربیت کەشتیك دەلیم زیدەرۆیی تیدا بیت. چونکە ئەو قسەیەی دەیکەم هی خۆم نیە. من بۆلای شایەتیکتان دەنیرم کەشایستەی متمانە پیکردنە، ئەو شایەتە خوداکەی دیلفییە•.. ئەو دەربارەی داناییەکەی**

---

• دیلفی Delphi یەکیکە لەشارەکانی یۆنانی دیرین، شوینی ئاهەنگگیران و یادکردنەوەی خوداوەندی ئەپۆلۆیە Apollo، دەکەویتە سەربەرزاییەکانی شاخی پارناس لەفۆسیس ( کەئیستا پیی دەوتریت ناوچەی فۆکیس) و نزیکەی 9.5 کیلۆمەتر لەکەنداوی کۆرینسەوە دوورە. ئەسیانییەکانی ئەوسا بەناوەراستی زەمین لەقەلەمیان دەدا. پیشتریش ناوچەی تایبەتی خوداوەندی زەمین بووە واتە گایا Gaea، بەپیی ئەفسانەکان ئەپۆلۆ ئەو ئەژدیهایەی کوشتووە کەپاسەوانی گایا بووەو گایای لەپیرۆزیی بیبەش کردووەو پیرۆزییەکەی بەخشیوە بەدیۆنیزیۆس. کاهینەکانی دیلفی چەند سروتیکی تایبەتییان پیرەو کردووەو سەرکردەیەکیان هەبووە پیی

**من بۆتان دەدویت، ئەگەر من داناییەکم هەبیت، هەروەها پیشتان دەلیت چ جۆرە داناییەکیشە. دەبێ ئیوە چیرۆفۆن بناسن، ئەو لەزووەوە هاوریی من بووە**

**21a هەروەها هاوریی ئیوەش بووە، چونکە بەشداریی کردووە لەدوورخستنەوەی ئەوخەلکانەدا کەلەم دواییەدا دوورتان خستنەوە، لەگەلٚ ئیوەشدا گەراوەتەوە. باشە، هەروەك خۆشتان دەزانن، چیرۆفۆن لەهەموو ئەو شتاندا کەکردوونی زۆر هەلەشە بووە. چووە بۆ پەرستگاکەی دیلفی و بەجەسارەتەوە پرسیاری لەسرووش• کردووە تاپیی بلیت.. وەك وتیشم، پیویستە**

---

وتراوە پیسیا، گوزارشتی لەوتەو پیشبینی و ئاخاوتنەکانی ئەپۆلۆ دەکردو دەیگەیاندن بەمرۆڤ. پیسیا سروشەکەی ئەپۆلۆی گەیاندووە بەهاوریکەی سۆکرات.

• سروش Oracle, وەلامیکە لەلایەنی یەزدانەوە یاخود هیزیکی ژووروی سروشتەوە، دەدریتەوە بە عابیدیك یان پرسیارکەریك، لەو شوینەدا کە سروشەکەی تیدا. ئەو وەلامەی کە واگریمانە دەکریت لەلایەنی ئیلهامی یەزدانییەوە درابیتەوە، لەریی نیوەندیکی مرۆییەوە ( یان سروشتییەوە ) دەگەیەنریت بە خەلك، لەریی کاریگەرییانەوە لەسەر چەند شتیك، وەکو لە زرنگەیەکەوە لەشاری دیریتی دۆدۆنای یۆنانییدا، یاخود هارەی زنجیریك کە رەشەبایەکی بەهیز دەیلەرینیتەوە، یاخود لەریی جولانەوەی ئاژەلیکی پیرۆزەوە.

**تکاتـــان لیبکـــەم کـــەپیم نـــەبرن، ئـــەو بەجەســـارەتەوە پرسـیاری 21b لەسـرووش کردبـوو پیـی بلیـت ئایـا کەسیك هەیە لەمن داناتر بیت، پیسیا وەلاّمـی دابـووەوە، کەسیکی لەمن داناتر بوونی نیە.**

**چـیرۆفۆن خـۆی مـردوە، بـەلاّم براکـەی کەلـەدادگا ئامادەیـە، راسـتی ئـەو قسـانە دەسـەلمینیت کـەمن دەیانکەم.**

**21c من بۆچی ئاماژە بۆ ئەمە دەکەم؟ چونکە خـەریکم بۆتان روون دەکەمەوە کەبۆچی ئەم شۆرەتە بەدەم هەیـە. کـاتیك گویـم لەوەلاّمەکـە بـوو، بـەخۆمم ووت، دەبـیّ خوداوەنـد مەبەسـتی لـەچی بیـت؟ لیکدانـەوەی ئـەم مەتەلەی ئەو چیە؟ چونکە من دەزانم داناییم نیـە، نەکـەم و نەزۆر. کەواتە دەبیّ مەبەستی لەچی بیت کەدەلیت من داناترینی پیاوەکانم؟ هـەرچۆنیك بیـت ئـەو خوداوەنـدەو، درۆ ناکات، چونکە درۆکردن دژی سروشتی خوداوەندان دەبیت. دوای تیرامانیکی دریـژ، بیرم لەریگایـەك کردەوە**

---

سرووش دەگەریتەوە بۆ سـەردەمە دیرینـەکان، لەمیسـری دیرینـدا، نزیکەی هەموو پەرستگاکان جیگای سـروش وەرگرتـن بـوون. دواتـر یەکیك لەخەسلەتەکانی ئامون بریتـی بـوو لەسـروش بۆهـاتن، لـەناو میرگی سیوادا لەمیسر ئەوکارەی دەکرد.

بۆ تاقیكردنەوەی پرسیارەكە. بیرم لەوەكردەوە كەئەگەر بتوانم تاقە پیاویك بدۆزمەوە لەخۆم داناتر بیت، ئەوا بەلگەی رەتكردنەوەی سروشەكەم دەست دەكەویت و دەتوانم بچم بۆ لای خوداوەندو، پیی بلیم" ئەوە پیاویكە لەمن داناترە، بەلام تۆ وتووتە من داناترین كەسم" بەم پییە، چووم بۆ لای پیاویك كەشۆرەتی دانایی هەبوو، كەوتمە تاقیكردنەوەی.. .. پیویست ناكات ناوی بهینم. سیاسەتمەداریك بوو كەهەلمبژاردبوو بۆ تاقیكردنەوە.. ئەنجامەكەشی بەمشیوەیەی خوارەوە بوو: كاتیك دەستم كرد بەقسەكردن لەگەلیدا، نەمتوانی بیر لەوە نەكەمەوە كەئەو بەراستی هیچ دانا نیە، ئەگەرچی لەلایەنی زۆركەسەوە بەدانا دادەنراو، خۆشی پیی وابوو كەدانایە، بەلام لەراستیدا وانەبوو.

21d ویستم بۆی روون بكەمەوە، كەئەو خۆی وادەزانیت دانایە، دەنا لەراستیدا دانا نیە. سەرەنجامەمەشی ئەوە بوو كەرقی لی هەلگرتم و، شەش حەوت كەسیكیش كەلەویٚ بوون و گوییان لەقسەكانمان بوو، ئەوانیش كەوتنە دوژمنایەتیكردنم. بۆیە ئەوم بەجیهیشت، بەدەم ریوە بەخۆمم دەووت: باشە، من گریمانەی ئەوە ناكەم هیچ كەسیك لەئیمە، هیچ شتیكی وا بزانیت كەبەراستی جوان و چاك بیت، بەمەش من لەو



باشـترم.. چونكـه ئـەو هيـچ نـازانيت، بـەڵام پيـی وايـە كـەدەزانيت. مــن نـازانم و ناشـليم دەزانم. كەواتـە بـەم سيفەتە تايبەتييەی دوايی من لەو باشترم. ئينجا چووم بۆ لای يەكيكی تـر كـە 21e ئەميان زياتر لافـی دانـايی ليدەدا، سەرەنجامەكەشم ريك وەك ئەوەی تر وابوو. بەمە ئـــەويش و ژمارەيـــەكی زۆری تريـــش خـــەلكم كـــرد بەدوژمنی خۆم.

ئينجـا يـەك لـەدوای يـەك، چـووم بـۆ لای هـەموو پياوەكان بێ ئەوەی بێ ئاگا بم لەو دوژمنايەتييە بيـت كـەبۆخۆمی دەسـازينم، مـن لـەوە دردۆنـگ بـووم و ليـی دەترسام: بەڵام ئـەوە ئـەركيك بـوو لەسـەر شـانم.. ، وام بـەبيردا هـات كەپيويسـتە جـارێ گرنگيـی بەوتەكـەی خوداوەند بدەم. بۆيە بەخۆمم وت، خودايە، دەبێ بچمە لای هەموو ئەوانەی كەواديارە دەزانن، دەبێ مانای 22a سروشەكە ليكبدەمەوە. من سويندتان بۆ دەخۆم!.. ئەی ئەسينييەكان بەسەگ سويند دەخۆم.. چونكە پيويستە راستييتان پی بليم.. ئەنجامی ئەركەكەی من تەنيا بريتی بـوو لەمـە: بـۆم دەركـەوت ئەوپياوانـەی لەهـەمووان شـۆرەتيان زيـاترە، ئەوانـە، بگـرە لەهـەموو كـەس گەمژەترن، بەلكو خەلكيكی لەوان نزمتر بەراستی داناترو باشتر بوون. مـن ئـەو چيرۆكی گەرانەكـەی خۆمنتـان بـۆ



دەگیرمەوە، بەدوای وتەکەی سرووشدا یان و وەکو ناوم لیناوە (کارەکانی هیراکلیس)* ویستوومە لەکۆتاییدا سرووشە رەت نەکراوەکە بسەلمینم. دوای سیاسەتمەدارەکە،

22b چووم بۆ لای شاعیرەکان، تراجیدیانووسەکان بن یاخود داستان نوسەکان یان هەرچەشنیکی تر. لەویش لەدلی خۆمدا دەمووت، ئیستا بەتەواویی بۆت دەردەکەویت کەتۆ زۆر لەوان نەزانتریت. بەمجۆرە، چەند برگەیەکی نایابم لەنوسینەکانیان وەرگرت، کەوتمە پرسیارکردن دەربارەی ماناکانیان .. وام دەزانی ئەوانە شتیکم فیردەکەن. ئایا ئیوە بروام پیدەکەن؟ هەست بەشەرمەزاریی دەکەم لەوتنی راستییەکە، بەلام پیویستە بلیم کەزەحمەتە لیرەدا تاقە کەسیك هەبیت و نەتوانیت لەوان باشتر دەربارەی شیعرەکانی ئەوان بدویت.

22c ئەوکاتەش زانیم کە شاعیرەکان بەهۆی داناییەوە شیعر نانوسن، بەلکو بەهۆی چەشنە سروشیکی بلیمەتانەوە، ئەوانە وەکو پیشبینیکەر یان بەختگرەوە

---

* لیرەدا سۆکرات مەبەستی لە هیراکلیسی کوری جۆپیتەرو ئەلکۆمانە کە نیمچەخودایەکی بەهیزو توانا بووە، دوازدە کاری بەمجار نارەحەت و نیوداری ئەنجامداوە.



وەهـان، کەئـەوانیش گـەلی شـتی بـاش دەلیـن، بـەلام خۆشیان لـەماناکانیان تیناگـەن. شـاعیرەکانیش وەکـو شـتیکی ئـاوا هاتنـە بـەرچاوی مـن، لەمـەش زیـاتر بـۆم دەرکـەوت کەلـەتویی بـەهیزیی شـیعرەکانیانەوە خۆیـان واتیدەگەن لەو پیاوانە داناتر بن کەخـەریکی شـتی ترن، وەلی ئەمانە بەهیچ جۆریك دانا نین. بۆیـە دەسبەرداریان بـووم و خۆمـم قـایل دەکـرد کـەمن لەبەرهـەمان هـۆی پیشووم لەگەلّ سیاسەتمەدارەکەدا، لەوانیش داناترم.

دواجـاریش، چـووم بـۆ لای پیشەسـازەکان، مـن بەهوشیارییەوە دەمزانی 22d کەهیچ نازانم، وەك دەشیت بلیم، دلنیاش بووم کەئەوانە گـەلی شـتی بـاش دەزانـن، لـیرەدا بەهـەلدا نـەچووبوم، چونکـە ئـەوان زۆر شـتیان دەزانـی کـەمن دەربارەیـان نـەزان بـووم، لەمەشـدا ئـەوان بەراستی لەمن داناتر بوون. بەلام سەرنجمدا کەتەنانەت پیشەسـازیکی زۆر باشـیش کەوتونەتـە هـەمان هەلـەی شاعیرەکانەوە.. لەبەرئەوەی ئەوان پیاوانیکی لیهاتووی کارکردن بوون، بەلام ئەوانیش پییـان وابوو کەدەربارەی مەسـەلە بلنـدو بالاکـان، هـەموو شـتیك دەزانـن، ئـەم ناتەواوییەش سیبەریکی بەسەر داناییەکەیاندا کیشاوە، 22e بۆیـە لـەبریتی سرووشـەکە لـەخۆمم پرسـی، ئایـا مـن پیمخۆش دەبیت هـەر ئـاواهی بم، واتـە هـەم زانینەکـەی



ئەوان و، هەم نەزانییەکەشیانم نەبێت، یاخود منیش وەکو ئەوان وابم لەهەردوکیاندا، وەڵامی خۆم و سرووشەکەم دایەوە کەمن چۆن هەم ئاوا باشترم.

ئەم لێپرسینەوەیە بۆتە هۆی ئەوەی ناحەزم زۆر ببێت، لەخراپترین و 23a مەترسیدارترین جۆریش، بواری رەخسان بۆ ئەوەی بوختانیکی زۆرم پێبکەن. من پێیم دەوترێت دانا، چونکە بیستەرەکانم وادەزانن خۆم ئەو داناییەم هەیە کەلای خەلك بۆی دەگەریم: بەڵام، ئێوە پیاوانی ئەسینا، راستییەکەی ئەوەیە بەتەنیا خوداوەند دانایەو، بەوەڵامەکەشی* هەولیداوە پیشانی بدات کە دانایی مرۆڤ یەکجار کەمە یان هەر هیچ نیە، ئەو دەربارەی سۆکرات

23b قسە ناکات، ناوی منی تەنیا بۆ روونکردنەوە بەکارهیناوە، وەك ئەوەی بلێت، ئێوە، پیاوینە، داناترین کەسیش، وەکو سۆکرات، دەزانێت کەلەراستیدا داناییەکەی هیچ نیە. بۆیە من گویرایەڵانە بۆ خوداوەند، دەگەریم و دەپشکنم و پرسیار لەدانایی هەرکەسێك دەکەم، چ هاوشاریی بێت یاخود بیگانە، کەوادیاربێت

---

* مەبەستی سۆکرات لەوەڵامەکەی خوداوەندە بۆ پرسیارەکەی چیرۆفۆن کە پرسیبووی لەسۆکرات داناتر کێیە؟

دانـابیت، وەلی ئەگـەر دانـا نـەبیت، ئـەوا ئـەو بەلگەیـەی لەسروشـەکەدا هەیـە، پیشـانی دەدات کـەدانا نیـە، ئــەم کارەشم بەتــەواویی داگیری کـردووم، هیـچ کـاتیکم نیـە تەنانـەت بایـەخ بدەم بـەهیچ بایـەتیکی 23c میللیـش، یـاخود بایـەخ بـەهیچ شـتیکی تایبــەتی خۆشـم بـدەم، هەربۆیەشــــە لەبــــەر دلســــۆزییەکەم بــــۆ یــــەزدان، هەژارو نەدارم.

شـــتیکی تریـــش هەیـــە.. لاوانـــی ســـەر بەچینـــە دەولەمـەندەکان، کـەهیچ شـتیکیان نیـە بیکـەن، خۆیــان لەدەورم کۆدەبنەوە، حەزدەکەن گوییـان لـەخۆ دەرخـەران بیـت کەتاقیدەکرینـەوە، زۆرجاریش لاسـایم دەکەنـەوەو، دەست دەکەن بەتاقیکردنـەوەی خـەلکی تـر، کەزۆریشـن، ئەمانیش هەرزوو بۆیان دەردەکەویت، کەئەوانەی پییـان وایە شتیك دەزانن، بەلکو لەراستیدا کەم دەزانن یان هیچ نـازانن، ئەوکاتــەش ئەوانـەی تاقیکراونەتـەوە، لـەجیاتی ئەوەی لەخۆیان توورە بن، لەمن توورە بوون: دەلیـن ئـەم سـۆکراتە نــەفرەتلیکراوە، 23d ئــەم فریــودەرە هیــچ و پووچـەی لاوەکـان!.. ئینجـا ئەگـەر یـەکیك پرسـیاریان لیبکـات، بۆچـی، ئــەو چ خراپەیــەك دەکـات و فـیری خەلکیشی دەکات.؟ ئەوان نازانن، ناشتوانن بیلیـن، بەلام بۆئــەوەی دۆراو دەرنەکــەون، هــــەمان ئــــەو تۆمەتــــە



حازربەدەستانە دووبارەدەکەنەوە کەئاراستەی هەموو فەیلەسوفەکان کراون، گوایە فیری ئەو شتانەمان دەکەن کەلەسەرووی 23eهەورەکان و ژیر زەمیندا بوونیان هەیە، هەروەها باوەریان بەهیچ خوداوەندیك نیە، بەرگی چاکە دەکەن بەبەری خراپەدا، چونکە ئەوان نایانەویت دان بەوەدا بنین کەخۆدەرخستنیان بەوەی دەزانن هەلمالراوە.. کەئەوەش راستییەکەیە، ئەوان زۆریشن و چاوبرسی و چالاکیشن، راشکیشراون بۆ شەرەکەو زمانیکی قایلکەرانەشیان هەیە، ئەوانە گویی ئیوەیان پرکردووە لەبوختانە سەختەکەیان. بۆیە ئەمەیە هۆی ئەوەی بۆچی 24a سێ تاوانبارکەرەکەی من میلیتۆس و ئانیتۆس و لیکۆن، دژایەتییم دەکەن، میلیتۆس دژم وەستاوەتەوە بۆ ئەوەی نوینەرایەتی شاعیرەکان بکات، ئانیتۆس لەجیاتی پیشەسازەکان و سیاسەتمەدارەکان، لیکۆنیش لەبری رەوانبیژەکان. هەروەك لەسەرەتاشدا ووتم، من ناتوانم لەیەك ساتدا ئەم هەموو بوختانە رەت بکەمەوە. پیاوانی ئەسینا، ئەمەش راستییەکەیەو هەموو راستییەکەشە، هیچ شتیکم نەشاردۆتەوە، هیچ شتیکم نەشیواندووە. لەگەڵ ئەوەشدا، دەزانم کەراشکاوییەکەم لەقسەکردندا، وایان لیدەکات رقیان لیم ببیتەوە، ئەم رقەش هیچ نیە لەبەر ئەوە نەبیت کەبەلگەیەکە لەسەر



24b ئـەوەی مـن راسـتی دەلیـم؟.. ئەمـەش ناحەقییەکـە بەرامبـەری مـن هـەوەها ئەمەشـە هۆیەکـەی، وەك بۆتـان دەردەکـــەویت لـــەم لیپرســـینەوەیەدا بیـــت یـــان لەلیپرسینەوەیەکی داهاتووتردا.

دەربـارەی گروپـی یەکـەمی تاوانبارکـەرانم، هینـدە بەسـە بـۆ داکۆکیکـردن. ئیسـتا دەچمـە سـەر گرووپـی دووەم. سەرکردەکەیان میلیتۆسە، ئەم پیاوە باشەی کە بەراستی بۆ شارەکەی خۆی دلسۆزە، وەك خۆی دەلیت. پیویسـتە لەبەرامبـەری ئەمانیشـدا، داکۆکییـەك لـەخۆم بکـەم.. گـەر شـایەتییە سـویند لەسـەر خوراوەکـەیان بخوینریتـەوە: شـتیکی لـەم بابەتـەی تیدایـە: دەلیـت سـۆکرات خراپـە کـارە، کـە لاوەکـان بـەدخوو دەکـات، بروباشـی بـەخوداوەندەکانی 24c شـار نیـە،بـەلکو یەزدانگەراییـەکی تایبـەت بـەخۆی هەیـە. ئەمەیـە تۆمەتەکە. بائیستا بەتایبەتی لیی بکۆلینەوە. ئەو دەلیت کەمن خراپە کارم، هەروەها لاوانیش خراپ دەکەم. بەلام ئـۆ پیـاوانی ئەسـینا، مـن دەلیـم میلیتـۆس خـۆی خراپەکارەو، لاوانیش تیك دەدات، ئەو لەکاتی جیدیـدا گالتـە دەکـات، ئـەو بـۆ خۆرانـان حـەزی لەوەیـە خـەلك رابکیشـیت بـۆ دادگـا، چیـژ لـەو مەسـەلانە وەردەگریـت



کەخۆی هەرگیز بایەخی پینەداون. من هەوڵ دەدەم راستیی ئەمەتان بۆ روون بکەمەوە.

میلیتۆس، وەرە پیشەوە، باپرسیاریکت لێ بکەم.

24d . تۆ زۆر بیر لەچاککردنی لاوان دەکەیتەوە؟

. بەلێ، وایە.

. کەواتە، بەدادوەران بلێ، چاککەری لاوان کێیە، چونکە پیویستە تۆ ئەمە بزانیت، مادام تۆ ئازارت پیگەیشتووە، بەوەی خراپکەرەکەیانت دۆزیوەتەوەو، هاتووی لەبەردەمی دادگادا تاوانبارم دەکەیت و شایەتییم لەسەر دەدەیت. بلێ، کەواتە بەدادوەران بلێ چاککەریان کێیە.. میلیتۆس دەبینم بیدەنگیت و هیچت پێ نیە بیلییت. بەڵام ئایا ئەمە تارادەیەك شەرمەزاریی نیە بۆ تۆو، بەلگەیەکی زۆر بایەخداریش بۆ سەلماندنی ئەوەی 24e کەمن دەمووت تۆ ئەم مەسەلەیەت بەلاوە گرنگ نیە؟ هاوریم، قسە بکە، پیمان بلێ کێ چاککەری لاوانە.

. یاساکان.

. بەڵام، گەورەی بەریزم، ئەمە مەبەستەکەی من نیە، من دەمەویت بزانم ئەو کەسە کییە، کییە ئەوەی لەهەموو کەس زیاتر شارەزای یاساکانە.

. سۆکرات، ئەو دادوەرانەی لەدادگادا ئامادەن.



**. 25a دەتـــەویت بلییـــت چـــی، میلیتـــۆس، ئـــەوان لەتواناياندا هەيە لاوان فير بكەن و چاكيان بكەن؟**

**. بيشك وان.**

**. چی، هەر هەموويان، يان تەنيا هەنديكيان، نەك هـەر هەموويان؟**

**. هەر هەموويان.**

**. بـــەهيرای• خوداوەنـــد ئەمـــە هـــەواليكی خۆشـــە! چاككەرانی لاوان زۆرن، كەواتە، بۆ ئامادەبووەكانی تری نـاو دادگـاش چـی دەلييـت.. ئايـا ئـەوانيش چاكيـان دەكەن؟**

**. بەلیٚ دەيكەن.**

---

• هـــيرا **Hera** لـــەميتۆلۆجيای گريكييـــدا، بريتيـــە لەشـــاژنی خوداوەندەكـان، كچـی كرۆنۆســـی **Cronus** مـــەزن و ريـــای **Rhea** هاوســەريتی، خوشـك و هاوســەری زيۆســـە **Zeus**. هـيراخوداوەندی زەماوەندو پاريزگاريی كردنی ژنانی بـەميرد بـووە. دايكـی ئاريسـی **Ares** خـــودای جـــەنگ و، هيفايستۆســـی **Hephaestus** خوداوەنـــدی ئاگرو، هيبای **Hebe** خوداوەنديی لاويی، لەگەلٚ ئيليتايـای **Eileithyia** خوداوەنـدی مندالبـــوون بـووە. هـيرا هاوســەريكی دلپيـس بـووە لەميردەكەی، زۆرجار ئـازاری ژنـە دۆسـتەكانی ميردەكـەی و مندالـە ناشـــەرعييەكانی دەدا، هـــەرگيز بريندارکردنـــی هەســـتی بـــير تەدەچووەو گيانيكی تۆلسينانەی هەبووە.



. سیناتۆرەکانیش؟

. بەڵێ سیناتۆرەکانیش چاکیان دەکەن.

. بەڵام رەنگە ئەندامانی ئەنجومەن خراپیان بکەن؟.. یان ئەوانیش چاکیان دەکەن؟

. ئەوانیش چاکیان دەکەن.

. کەواتە هەموو ئەسینییەکان چاکیان دەکەن و بەریزیان دەکەن، هەموویان جگە لەمن، منیش بەتەنیا خراپیان دەکەم؟ ئایا ئەمەیە کەتۆ جەختی لەسەر دەکەیت؟

جاخۆ ئەگەر وابیت ئەوا من زۆر بەدبەختم. بەڵام وادابنێ من پرسیاریکی تریشت لیدەکەم: ئەی دەربارەی ئەسپ دەلییت چی؟ ئایا یەك دانە پیاو خراپەیان لەگەلدا دەکات و هەموو جیهانیش چاکەیان لەگەلدا دەکەن؟ ئایا پیچەوانەی ئەمە بەتەواویی دروست نیە؟ یەك پیاو دەتوانیت چاکەیان لەگەلدا 25b بکات، یاخود بەلایەنی کەمەوە چەند کەسیکی زۆر نا.. مەیتەری ئەسپ، ئەگەر بلییت ئەو چاکەیان لەگەلدا دەکات، ئەوانیتریش کەکاریان پیدەکەن و ئازاریان دەدەن؟ میلیتۆس ئەمە بۆ ئەسپەکان، یان هەر گیانەوەریکی تر راست نیە؟ بیشك راستە، ئەگەر تۆ یان ئانیتۆس بشلین بەلی 25c یان نەخیر. بەراستی ئەگەر لاوەکان تەنیا یەك خراپکەریان



هـەبیت و، سـەرباقی جیـهانیش چاککـەرانیان بـن، ئـەوا حالیــان هــەر زۆر بــاش دەبیــت. بــەڵام میلیتــۆس، تــۆ بـەروونیی دەرت خسـت کـەهیچ شــتیك دەربــارەی لاوان نازانیت: بیموبالاتییەکەت لەوەدا دیارە کەگوێ نادەیتە ئەو هەموو شتانەی دژی من هیناوتنەتەوە.

ـ ئیستا، میلیتۆس، پرسیارێ کی تریشت لیدەکـەم.. تــوو زیــۆس•، کامیــان باشــترە، لــەناو هاوشــارییە خراپەکاندا بژیت، یاخود لـەناو هاوشـارییە باشـەکاندا؟ هــاوریم، وەڵام بــدەرەوە، مــن دەلیــم: پرســـیارەکە، پرسیاریکە بەئاسانی وەڵامـی دەدریتـەوە. ئایا چاکـەکان چاکــە لەگــەڵ دراوســیکانیاندا ناکــەن، خراپــەکانیش خراپەیان لەگەلدا ناکەن؟

---

• زیــۆس Zeus لــەمیتۆلۆجیای یۆنــانییدا، خوداوەنــدی ئاسمــان و فـەرمانرەوای خوداوەندەکـانی ئۆلیمپـە، رۆمانییـەکان پیـی دەلیـن جۆپیتـەر Jupiter. بــەپیی گیرانــەوەی هۆمــیرۆس زیــۆس بــاوکی خوداکــان و نەمرەکانــە. ئــەو هیــچ خوداوەندیـك یــان نــەمریکی نەخولقاندووە، بەڵام بەو سـیفەتەی پـاریزەرو فـەرمانرەوای خـیزانی ئۆلیمــپ و رەچەلــەکی مرۆڤیشــە، بــەباوکیان لەقەلــەم دەدریــت. سەروەری ئاسمان و بارانیشەو هەورەکانیش بەریوە دەبات خاوەنی هــەورە بروســکەی تۆقینــەرە، بــالندەی هــەلبژاردەی داڵ بــووە، درەختی خۆشەویستی داربەرووە.

. بێ شك.

25d . جا ئایا كەس هەیە حەز بكات ئەوانەی لەگەلیدا دەژین خراپەی لەگەلدا بكەن نەك چاكە؟ وەلام بدەرەوە، هاورێ باشەكەم، یاسا داوات لیدەكات وەلام بدەیتەوە.. كەس هەیە حەز بكات ئازاری بدریت؟

. بیگومان نا.

. جاكەتۆ تاوانبارم دەكەیت بەوەی لاوان خراپ دەكەم و خوویان شەر دەكەم، تۆ دەلییت من بەمەبەست خراپیان دەكەم یان بەبێ مەبەست؟

. دەلیم بەمەبەست.

. بەلام تۆ هەرئیستا دانت بەوەدا نا، كەچاكەكاران چاكە لەگەل دراوسیكانیاندا دەكەن، خراپەكارانیش خراپەیان لەگەلدا دەكەن. ئیستا، ئایا 25e ئەوە راستە كەداناییە بلندەكەی تۆبەم تەمەنە كەمەتەوە گەیشتۆتە ئەوەی كە، من لەم تەمەنەی خۆمدا، ئەوەندە بیرتاریك و گیلم كەنەزانم ئەگەر ئەو پیاوانەی دەبیت من لەگەلیاندا بژیم، بەهۆی منەوە خوویان شەر كرابیت، زۆر بەسانایی لەلایەنی ئەوانەوە ئازار دەدریم، كەچی خۆم خوویان شەر بكەم و بەئەنقەستییش وابكەم، تۆ ئاوا دەلییت، لەوباوەرەدا نیم بەم قسانە نەمن و نەهیچ كەسیكی ترت پێ قایل بكریت. كەواتە من یان خوویان شەر ناكەم ،



یاخود بەمەبەست وا ناکەم، لەهەردوو حالەتەکەشدا تۆ درۆ دەکەیت. ئەگەر خراپەکارییەکەم بەمەبەست نەبێت، یاسا سزای خراپەی کاری بێ مەبەست نادات، دەبوو تۆ بەشێوەیەکی تایبەتی پێت بوتمایەو وریات بکردمایەتەوەو ئامۆژگارییت بکردمایە، چونکە من ئەگەر بەشێوەیەکی باشتر ئامۆژگاریم بکرایە، ئەوا دەستبەرداری ئەوە دەبووم کەبەبێ مەبەست کردوومە.. گومان لەوەدا نیە کەدەمکرد. بەڵام تۆ هیچت پێ نەووتم، نەتویست فێرم بکەیت، ئیستاش منت هیناوە بۆ ئەم دادگایە، کەشوێنی فێرکردن نیە، بەلکو شوێنی سزادانە.

ئەسینییەکان، هەروەکو باسمکرد، بۆتان روون بۆوە، کەمیلیتۆس بەهیچ جۆریك گوێ نادات بەمەسەلەکە، نەکەم و نەزۆر. بەڵام میلیتۆس هیشتا 26a هەر حەز دەکەم بزانم، من بۆچی لاوان خراپ دەکەم، وەك لەتۆمەتەکەی تۆوە بۆم دەردەکەویت، من فێریان دەکەم باوەر نەکەن بەو خوداوەندانەی کەشار باوەری پێیانە، بەڵام چەشنە یەزدانگەرییەك یاخود رۆحیانەتیکی تازە دەخەمە جیگەیان، ئەمە ئەو فێرکردنەیە کەبەهۆیەوە من خووی لاوان شەر دەکەم، وەکو تۆ دەڵییت.

. بەلێ بەمکومیی وادەلیم.

. کەواتە، تو یەزدانەکان، میلیتۆس، ئیمە دەربارەی کێ دەدوویین، 26bبەراشکاویی بەمنیش و بەدادگاش بلێ، مەبەستت چیە! چونکە من هیشتا لەوە تیناگەم ئایا تۆ جەخت لەوە دەکەیت ئایا من پیاوانی تر فیر دەکەم تاباوەر بەخوداوەندیك بهینن، کەواتە من باوەرم بەخوداوەندەکان هەیە، هەروەها من بەتەواویی بێ خوداوەند نیم.. تۆ لەشکاتەکەتدا باسی ئەمەت نەکردووە.. بەلکو تەنیا دەلییت ئەوانە هەمان ئەو خوداوەندانە نین کەشار دەیانناسن.. تۆمەتەکە ئەوەیە کەئەوانە خوداوەندی جیاوازن. یاخود تۆ مەبەستت لەوەیە کەمن بەسادەیی بێ خوداوەندم و، مامۆستای بێ خوداوەندییم؟

. من مەبەستم لەمەی دواییانە.. تۆ بەتەوایی بێ خوداوەندیت.

چەند دەربرینیکی نائاساییە! میلیتۆس، تۆ بۆچی پیت وایە؟ ئایا 26cبەراستی پیتوایە من باوەرم بەهیچ خودایەك نیە؟ مەبەستت لەوەیە کەمن وەکو خەلکی تر باوەرم بەخوداوەندایەتی خۆر یان مانگ نیە؟

. دادوەرینە من دلنیاتان دەکەم، ئەو باوەری پییان نیە: چونکە دەلیت خۆر بەردە، مانگیش خاکە.

**. هــاوریم، میلیتــۆس، تــۆ پێــت وایــە کــە تــۆ ئەناکساگۆراس• تاوانبار دەکـەیت: هـەروەها تـۆ خـراپ لەدادوەرەکان تێگەیشتوویت، گەر وابزانیت ئەوان هەتا ئەو رادەیە بێئاگان کەنەزانن ئەم پیرەوانە لەکتێبەکانی ئەناکساگۆراسی کلازۆمینیدا هـەن، کـەپڕن لـەم شـتانە. بۆیــە بەراســتی ئــەوەی دەوترێــت کەســۆکرات فــێری لاوەکـانی دەکـات، کـەچی گـەلێك جـار لەســەرتەختەی**

---

• ئاناکساگۆراس Anaxagoras (500?-428BC) فەیلەسوفیکی یۆنانییـە کـە پێناسـەی بیرۆکـەی نـاوس ـ واتـە عـەقلی کـردووەو کردوویـەتی بەیـەکیك لـە رەگـەزە بنەرەتییـەکانی فەلسـەفە، چونکـە پێـش ئـەو فەلسـەفە تـەنیا خـاك و هـەواو ئـاگرو ئـاوی بەرەگـەزی بنچینـەیی دادەنا. ئەناکساگۆراس یەکەمین فەیلەسوفە کە لەئەسینا نیشـتەجێ بوویـت، کـەدوای ئـەو دەبێـت بەسـەنتەریکی گەشـاوەی فەلسـەفە. لەقوتابییەکانی ئەم فەیلەسوفە پارکلیس و یۆرپیـدس و هـەندیکیش دەلین سۆکراتیش بوون. ئەناکساگۆراس نزیکەی سی ساڵ لەئەسینا وانـەی وتووەتـەوەو، پاشـان لەبەرئـەوەی دەیـووت خـۆر جگـە لەبـەردیکی گـەرم و مـانگیش تـەنیا خاکیکـەو هیچـی تـر، دەخریتـە زیندانەوە. یەکەمین کەسە کە دەلیت هەموو مادەکان لەگەردیلە پیك دین کە بچوکترین بەشی پیکهینەری ماددەکانە.



شـانۆ بیسـتراون[١] و نرخـی چوونــەژوورەوەی شـانۆش ئەوپەرەکەی یەك دراخمایە ئەوان دەتوانن پارە بدەن و بەسۆکرات پێبکەنن، ئەگەر سۆکرات خۆی وادەربخات خاوەنی ئەم تیروانینە نائاساییانەیە. بۆیە، میلیتۆس، ئایا تۆ بەراستی پێتوایە کەمن باوەرم بەهیچ خودایەك نیە؟

26d میلیتۆس: سوێند دەخۆم بەزیۆس، کەتۆ بەهیچ شێوەیەك باوەرت بەهیچ خودایەك نیە.

سۆکرات: کەس باوەرت پێناکات، من زۆر دلنیام کەتۆ خۆشت باوەر بەخۆت ناکەیت، پیاوانی ئەسینا، من ناتوانم واز لەو بیرکردنەوەیە بهێنم کەمیلیتۆس هەلەشەو هەرچی و پەرییە، ئەم تۆمەتەی بەرۆحیکی هەلەشەو هەلەت و پەلەت و سەرکیشییکی هەرزەکارانەوە نوسیوە. ئایا ئەو مەتەلیکی 26eتیکەڵ و پێکەڵ نەکردووە، بەخەیالی خۆی منی بێ تووش بکات؟ لەبەرخۆیەوە وتویەتی.. دەبینم ئایا سۆکراتی دانا دەرك بەناکۆکییە قۆشمەکەم دەکات، یاخود ئایا دەتوانم ئەویش و

---

[١] رەنگە لەئاماژەکانی ئەریستۆفانی گالتەجاردا بووبێت، یاخود یۆرپیدس کە بیرۆکەکانی ئەناکساگۆراسی خواستۆتەوە، هەروەها شاعیرە درامییەکانی تریش.

ئەوانیتریش فریو بدەم. چونکە بەدلنیایی لای من روونە کەئەو لەتاوانبارکردنمدا، لەگەڵ خۆشیدا ناکۆکە، دەڵیت سوکرات تاوانبارە بەوەی باوەری بەخوداکان نیە، هەروەها باوەریشی پێیانە.. وەلی ئەمە ئیشی کەسیك نیە کەبەراستی بیت.

27a حەزدەکەم ئیوەش، ئۆ پیاوانی ئەسینا، لەگەلمدا بینە ناو تاقیکردنەوەی ئەوەی کەمن پیموایە ناکۆکییەکەی ئەوی گرتۆتە خۆی، هەروەها ئایا میلیتۆس تۆ وەلام دەدەیتەوە. پیویستە تکاکەم بیری بینەران بخەمەوە کەئەگەر بەوشیوەیەی راهاتووم ئاوا قسەم کرد، ئەوان بۆژۆم نەکەن:

. میلیتۆس، ئایا تۆ هەرگیز باوەرت بەبوونی پیاویك هەبووە باوەری 27b بەبوونی شتەکان هەبووبیت، بەلام باوەری بەبوونی مرۆڤ نەبووبیت؟.. پیاوانی ئەسینا، حەزدەکەم وەلامم بداتەوە، نەك بەردەوام هەر هەلپەی ئەوەی بیت قسەم پێ ببریت. کەس هەیە باوەری بەمەیتەریی هەبیت بەلام باوەری بەئەسپ نەبیت، یان باوەری بەژەنینی فلوت هەبیت ، بەلام باوەری بەفلوت ژەن نەبیت؟ نەخیر، هاوریم، من وەلام بۆ تۆو بۆ دادگاش دەدەمەوە، مادام تۆ ناتەویت بۆخۆت وەلام بدەیتەوە. هەرگیز پیاویکی ئاواهی بوونی 27c نیە. بەلام ئیستا

تکایە وەڵامی ئەم پرسیارەی تریان بدەرەوە: ئایا پیاویك دەتوانیـت بـاوەری بەرۆحانییـەت و هـیزە یەزدانییـەکان هـەبیت، بەڵام بـاوەری بـەرۆح یـان نیمچـەخوداوەندەکان نەبیت؟

. ناتوانیت.

. مـن چـەند بەختـەوەرم کەبـەیاریدەی دادگـا، ئـەم وەڵامـەم لێ دەرکیشایت!بەڵام تۆ لەتۆمەتەکەدا سویندت خـوارد کـەمن بـاوەرم بـەهیزە یـەزدانیی و رۆحییـەکان هەیەو فیری خەلکیشیان دەکەم ( تازە بن یان کۆن، ئەوە گرنـگ نیـە)، هـەرچۆنیك بیـت، مـن بـاوەرم بـەهیزە رۆحییـەکان هەیـە.. تـۆ بەخـەتی خـۆت وات نوسـیوەو سویندیشت لەسەری خواردووە، من چۆن دەتوانم باوەرم بە رۆح یـاخود نیمچـە یەزدانـەکانیش نـەبیت، دەتـوانم؟ بۆئـەوەی دلنیـا بیـت، پیویسـتە مـن، هەرلەبەرئـەوەش دەبیـت واگریمانـە بکـەم کەبیدەنگییەکـەت مانـای رازیبیبـوون رادەگەیـەنیت. ئیسـتا رۆحـەکان یـان 27dنیمچەخوداکان چین؟ ئایا ئەوانە خودا نـین، یـاخود نەوەی خوداکان نین؟

. بێ شك وان.

. بـەڵام ئەمـە ئەوەیـە کـەمن پیـی دەلیـم ئـەو مەتەلـە قۆشمەیەی تۆ دات هیناوە: نیمچەخوداکان یان رۆحەکان



خـودان، تـۆش یەکـەمجار رادەگەیـەنیت کـەمن بـاوەرم بەخوداکان نیە، ئینجا جاریکی تر دەلییت کەمن باوەرم بـــەخوداکان هەیـــە، چونکـــە، ئەگـــەر مـــن بـــاوەرم بەنیمچـەخوداکان هـەبیت. هـەروەها نیمچـە خوداکـان نەوەی ناشەرعیی خوداکان بن، چ بەهۆی حۆرییەکانەوە• یـان هـەردایکانیکی تـرەوە بیـت، بـۆ ئەوانـەی کـەپییان دەوتریت کورەکانیان.. چ مرۆڤیك باوەر بەوە دەکات کە خوداکان بوونیـان نیـە ئەگـەر نـەوەکانی خـودا بوونیـان هـەبیت؟ لەوانەیـە تـۆ جـەخت لـەبوونی ئیسـتر بکـەیت، 27eبەلاّم نکولیی لەبوونی ئەسپ و کەر بکەیت. میلیتۆس نابیت ئەم شتە پروپووچە وای لەتۆ کردبیت شـکاتم لی بکـەیت. تـۆ ئەمـەت خسـتۆتە نـاو تۆمەتەکـەوە، لەبـەر ئەوەی هیچ شتیکی راستەقینەت بەدەستەوە نیە تا منی پـێ تاوانبـار بکـەیت. بـــەلام هەرکەســیك تۆزقـــالیك

---

• حـۆری Nymphs لـەمیتۆلۆجیای گریـك و رۆمانـەکاندا، ئاسـتیکی نزمـتریی یـەزدانیتیی یـاخود گیـانی سروشـتە، نیشـتەجیی ناوبـاخ و بیستان و مـیرگ و تاڤگـەو کـانی و روبـارو دەریاکانـە، خـۆی وەکـو کچیکـی پـاکیزەی جـوان دەنوینیـت کەخـەریکی مۆسـیقا ژەنینـەو سەماشـی لەگـەلدا دەکـات. حۆرییـەکان بـەو شـوینەوە دەناسـران کەتییدا نیشتەجێ ببوون، وەکو حۆری دەریـا یـان حـۆری بیسـتان، یاخود کچی ئەوان، حۆری شاخەکان یان دارستانەکان .. هتد.



تیگەیشتنی هەبیت، تۆ 28aناتوانیت قایلی بکەیت بەوەی پیـاویك بـاوەری بەیـــەزدانیتی و شــتە ژوور مرۆییـــەکان هــەبیت، بــەڵام بــاوەری بــەخوداکان و نیمچــەخوداکان و پالەوانەکان نەبیت.

ئەوەی پیویست بوو لەوەڵامی تۆمەتەکەی میلیتۆسدا وتم: ئیـتر هـەر داکۆکییـەکی دریژتـر پیویسـت نیـە، بـەڵام مـــن بـــاش دەزانم کەچـــەند دوژمنایـــەنیم بۆخـــۆم خولقـاندووە، هەرئەمـەش دەبیـە هـۆی رووخـاندنی مـن ئەگەر بروخیم.. میلیتـۆس نـا، هـەروەها ئانیتۆسـیش نـا، بەلکو ئەو قین و ئیرەییەی جیهانە کەبووەتە هۆی مردنـی چەندان پیاوی باش، هەروەها ریی تیدەچیت ببیتە هـۆی مردنی زۆری تریش، مەترسیی ئـەوە لـەگۆریَ نیـە کـەمن دواهەمینیان بم.

28bرەنگــە یــەکیك بلیــت: سۆکــرات شــەرم لــەژیانیك ناکـەیت، کەخەریکـە بـەرەو کۆتاییـــەکی ئــاوا دەتبــات؟ بەنەرمییەکــەوە وەڵامــی ئــەو کەســەش دەدەمــەوە: تــۆ بەهەلـەداچوویت، پیـاو بەکەلکی هــەموو شـتیك دیـت و، نابیت گویَ بداتە فرسەتی ژیان و مـردن، دەبیـت بەتـەنیا بایـەخ بـدات بـەوەی هـەر شـتیك کـەدەیکات راسـتە یـان هەلەیـە.. رۆلـی پیـاوی بـاش ببینیـت یـان هـی 28cخـراپ. بۆیــە لــەتیروانینی تــۆوە، ئــەو پالەوانانــەی لەتــەروادەدا



**کــوژران باشـــیان نـــەکردوو، کورەکـــەی تیتیســـیش• لەسەرووی هەموویانەوە، کەهەموویان بەیەکەوە گاڵتەیان بەمەترسـی دەهـات و نەیاندەویسـت خۆیـان سـووک و ریسوا بکەن، کاتیك بـە پەرۆشـەوە دەیویست لەتۆڵـەی پاترۆکلیسـی هـاوریێدا، هیکتـــۆر• بکوژیـــت، دایکـــە**

---

• تیتیس Thetis لـەمیتۆلۆجیای گریکییـدا، کچـی نـیرۆس و دۆریسـە Nereus and Doris کەسەر بەخوداوەندنیتی دەریان و وەکو نیریدیس Nereids شـــۆرەتیان دەرکـــردووە، زیۆســـی Zeus گـــەورەی خوداوەندەکـان و پۆسـیدۆنی Poseidon خوداوەنـدی دەریـا حـەزیان لیدەکرد، هەتا ئەوکاتەی هـەردوکیان ئـەو پیشـبینییەیان زانـی کـە، ئەم ژنە کوریکی دەبیت و کورەکەش باوکی خۆی دەکوژیـت. بۆیـە دایـان بـە پیلیەسـی Peleus فـەرمانرەوای مـیرمیدۆنس، کـەپیاویکی فانی بوو. تیتۆس لـە پیلیـەس پاڵـەوانیکی بـوو ناویـان نـا ئەشـیل Achilles.

• هیکتـۆر Hector لـەمیتۆلۆجیای گریکییـدا، کورەگـەورەی پادشـا پیرام و شاژن هیکۆبایە، کەپادشاو شاژنی تەروادە بـوون، هـەروەها هاوسـەری ئەندرۆماخیشـە. لەئـەلیادەی هۆمـیردا، هیکتـۆر ئـازاترین شـەرکەری تەروادەیـە. بۆمـاوەی نۆسـاڵ سـەرکردەی هیزەکـانی تـەروادە بـووەو دواجـار گریکـەکانی ناچـارکرد بچنـەوە بـۆ نـاو پاپۆرەکانیان، هەرچۆنیك بیـت هیکتـۆر، پـاترۆکلیس دەکوژیـت کـە خۆشەویسترین هاوریی ئەشیل بووە، کەئەمیان ئـازاترین پاڵـەوان و

**یەزدانییەکەی بەم وشانە یان چەند وشەیەکی تری لەم بابەتە، پیی ووت ( ئەگەر تۆڵەی پاترۆکلیسی هاوریت بکەیتەوەو، هیکتۆر بکوژیت، ئەوا خۆشت دەمریت، دوای مردنی هیکتۆر، هەمان چارەنووس چاوەریی تۆش دەکات). ئەو ئاگادارکردنەوەکەی پیگەیشت، بەڵام گویی نەدایەو، لەجیاتی ئەوەی لەمەترسیی و مەرگ بترسیت، گالتەی پییان هات و 28dبیزی لیکردنەوە، زیاتر لەوە دەترسا بەبێ کەرامەتی ژیان بەسەر ببات و تۆڵەی هاوریکەی نەکاتەوە. بۆیە وەڵامی دایکی دایەوە" با تۆڵە لەدوژمنەکەم بکەمەوەو یەکسەر بمرم، نەك لیرە لەسەر ئەم پاپۆرانە بمینمەوەو ببمە پەلەیەکی شەرمەزاریی بەسەر رووی زەوییەوە" . ئەشیل هیچ بیریکی لەمەرگ و مەترسی کردبۆوە؟ چونکە مرۆڤ لەهەرشوینیك بیت، چ ئەو شوینەی کەخۆی هەلی بژاردووە، یاخود لەلایەنی سەرکردەیەکەوە لەویدا دانراوە، ئەوا پیویستە لەکاتی مەترسیدا خۆی رابگریت، جگەلەوەی بیربکاتەوە**

---

شەرکەری یۆنان بووەو، لەداخی ئاگامەمنونی سەرکردەی هیزە گەمارۆدەرەکان لەشەر کشابووەوە، ئەشیل لەتۆڵەی پاترۆکلیسدا هیکتۆر دەکوژیت و ئەمەش خالی سەرەکیی رمانی تەروادە دەبیت.



ئابرووی نەچێت، نابێت بیر لەمەرگ و هیچ شتێکی تر بکاتەوە. ئەمەش، ئۆ، پیاوانی ئەسینا، قسەیەکی راستە.

28eئۆ، پیاوانی ئەسینا، ئەگەر ئەو جەنراڵانەی خۆتان هەڵتان بژاردبوون، بۆ ئەوەی لەپۆتیدیاو ئەمفیپۆلیس و دیلیومدا* سەرکردایەتیمان بکەن، فەرمانیان پێبکردمایە لەو شوێنەدا بمینمەوە کەئەوان بۆیان دیاریی کردبووم، تاکو هەر پیاوێکی تر رووبەرووی مەرگ ببمەوە، بەڵام من وام نەکردایە، ئەوکاتە رەفتارەکەم یەکجار نامۆ دەبوو.. ئەی ئەگەر ئێستا، کاتێك من پێموایەو ئەندیشە دەکەم، کەخوداوەند فەرمانم پێدەکات، بەناو خودی خۆم و پیاوانی تردا بگەڕێم و، رۆڵی فەیلەسوف ببینم. بیم لەترسی مردن، یان لەبەر هەرترسێکی تر، ئەرکەکەی سەرشانم بخەمە لاوە، بەراستی ئەمە شتێکی نامۆ دەبێت. ئەگەر گوێرایەڵی سرووشەکە نەبم، ئەوا جێی خۆی دەبێت، بەتۆمەتی کفرکردن بەبوونی یەزدانەکان بهێنریم بۆ

---

* سۆکرات لەشەڕی پیلۆپینیشیاندا، وەکو سەربازێکی پیادە بەشداریی کردووەو لەشەڕەکانی پۆتیدیا ٤٣٢ ـ ٤٣٠ ، هەروەها دیلۆم ٤٢٤، لەگەڵ شەڕی ئەمفیپۆلیشدا، زۆر ئازایانە جەنگاوەو هەرگیز سەنگەری چۆڵ نەکردووە.

دادگا، 29aلەبەرئەوەی لەمردن دەترسم، بەخەیالی خۆم من دانابووم، بێ ئەوەی وابم. چونکە لەراستیدا، ترسان لەمردن بریتیە خۆپیشاندان بەوەی داناییت هەیە، نەك داناییەکی راستەقینە. خۆدەرخستن بەزانینیکی نەزانراو، هەروەها کەس نازانیت ئایا مردن، کەمرۆڤ ئەوەندە لیی دەترسیت، کەبەگەورەترین 29bخراپە دایدەنیت، کێ نالیت گەورەترین چاکە نیە. ئایا ئەمە نەزانییەکی پر شورەیی نیە، شورەیی ئەوەی مرۆڤ لافی زانینی شتیك لیبدات کەنایزانیت؟ منیش تەنها لەمەدا بروام وایە کەخۆم لەخەلکی تر جیا بکەمەوە، لەوانەشە هەر بەمەندە بتوانم بلیم من لەوان داناترم: ئەمەش چونکە من شتیکی کەم لەجیهانی ژیرەوە دەزانم، گریمانەی ئەوە ناکەم کە دەزانم: بەلام بروام وایە کەنادادپەروەریی کردن و یاخی بوون لەشتیك کەباشتر بیت، چ مرۆڤ بیت یاخود یەزدان، شتیکی خراپ و ناشکۆمەندانەیە، بۆیە من هەرگیز لەچاکەی شیاو ناترسم و خۆمی لێ لانادەم بۆ خاتری خراپەیەك کەدبەدلنیایی هەیە. هەربۆیەشە ئەگەر ئیستا لیم بگەرین برۆم و 29cبەقسەی ئانیتۆس نەکەن، کەهەر لەسەرەتای دادگاییکردنەکەمەوە داوای مردنم بۆ دەکات ( یاخود ئەگەر هەر لەسەرەتاوە دادگاییتان نەکردمایە)، یان



ئەگــەر ئیســـتا رابكـــەم، ئـــەوا كورەكانتـــان بەبیســـتنی قسەكانی من بەتەواویی بەدخوو دەبن.. ئەگەر پیم بلیـن، سـۆكرات ئـەمجارە گـویَ لـەئانیتۆس نـاگرین و ئـازادت دەكـــەین، بـــەلاّم بەمـــەرجیك، چیـــتر بـــەم شـــیوەیەی 29dئیسـتات پرسـیار نەكـەیت و بـیر نەكەیتـەوە، ئەگــەر جاریكی تر بتگرین كەوادەكەیت، ئەوا دەمریـت.. ئەگەر ئەمە ئەو مەرجە بیت كەبەهۆیەوە لیم دەگەرین برۆم، ئەوا وەلاّمتان دەدەمەوە: پیاوانی ئەسینا، من ریزتان لیدەگرم و خۆشم دەوین، بەلاّم من زیاتر گویرایـەلی خـودا دەبم نەك ئیوە، من هـەتا بژیـم و تینـم تیـدا مـابیت، هـەرگیز دەســـبەرداری كـــردن و فـــیربوونی فەلســـەفە نـــابم، هەركەسیكیش بینم ئامۆژگاریی دەكەم و پیی دەلیم: تۆ، هاوریم.. ئەی هاوشاریی ئەسینای مەزن و بەهیزو دانا.. شـەرم ناكـەیت لـەوەی 29eپـارەو پـوولی زۆرو شـۆرەت و شـكۆمەندیی خربكەیتـــەوە، كـــەچی بایـــەخیكی كـــەم بەدانایی و راستی و پەرەپیدانی زیاتری رۆح دەدەیـت، كەهـەرگیز گویت پینـەداوە؟ گـەر ئـەو كەسـەی لەگـەلیدا دەدویم وتی: بەلی، بەلاّم من بایـەخیان پیدەدەم، ئەوسا جیی ناهیلم، یان ناهیلم یەكسەر بروات، بەلكو دەست دەكەم بەلیپرسینەوەی و تاقیكردنەوەی و بەقسەهینانی، ئەگەر پیموابوو هیچ چاكەیەكی تیدا نیە، بـەلكو تـەنیا



لافی ئەوە لیدەدات کەهەیەتی، گلەیی و سەرکۆنەیەکی زۆری دەکەم و، زیدەرۆیی دەکەم لەوەدا کەپیی بلیم تۆ شتە 30aنایابەکانت پشتگوێ خستووە. هەمان ئەم وشانە لەگەڵ هەموو ئەوانەدا دووبارە دەکەمەوە کەپییان دەگەم، گەنج بن یان پیر، هاوشاریی بیت یان غەریبە، بەڵام بەتایبەتی لەگەڵ هاوشارییەکانمدا، چونکە ئەوان بەشیوەیەك لەشیوەکان برای خۆمن. چونکە ئیستا ئەمە فەرمانی یەزدانە: هەروەها منیش باوەرم وایە کەهیچ چاکەیەکی لەمە گەورەتر لەم شارەدا هەرگیز رووی نەداوە، لەچاو خزمەتەکانی مندا بۆ خودا. بۆیە من هیچ ناکەم و دەگەریم و هەمووتان قایل دەکەم، گەنج و پیر وەکو یەك، نەك بۆئەوەی بیر لەخۆتان 30bیاخود مولکەکانتان بکەنەوە، بەلکو یەکەم و بەشیوەیەکی سەرەکی بۆ ئەوەی بایەخ بدەن بەپەرەپیدانی مەزنیی رۆح. من پیتان دەلیم کەچاکە بەپارە پەیدا ناکریت، بەلکو لەچاکەوە پارەو هەموو شتیکی باش دەستی مرۆڤ دەکەویت، گشتی هەوەکو تایبەتی. ئەمەیە وانەکانی من، ئەگەر ئەمەش ئەو پیرەوەیە کەلاوان بەدخوو دەکات، ئەوا من پیاویکی خراپم. بەلام ئەگەر یەکیك بیت و بلیت ئەمە فیرکردنەکانی تۆ نیە، ئەوە راست ناکات. لەپیناوی ئەمەدا، ئۆ، پیاوانی ئەسینا،



پیتان دەلیم یان ئەوە بکەن کەئانیتۆس داوای دەکات، یاخود ئەوە مەکەن کەئانیتۆس داوای دەکات، هەروەها ئەگەر تەبرییەم بکەن یان نا، هەرچییەك بکەن، دەبیت لەوە تیبگەن 30cکەمن هەرگیز ریبازەکەی خۆم ناگۆرم، تەنانەت ئەگەر پیویست بکات چەند جاریکیش بمرم.

پیاوانی ئەسینا، قسەم پی مەبرن، بەلکو گویم لیبگرن، ئیمە لەسەر ئەوە ریکەوتبووین کەدەبیت هەتا کۆتایی گویم لیبگرن: شتیکی تریشم هەیە سەبارەت بەوە بیلیم، کەرەنگە بیکەن بەهاتوهاوار لەسەری: بەلام من لەوباوەرەدام ئەگەر گویم لیبگرن بۆخۆتان باشە، بۆیە تکاتان لیدەکەم مەیکەن بەهەرا. من دەمەویَ بزانن کەئەگەر یەکیکی وەکو من بکوژن، ئیوە خۆتان بریندار دەکەن، زیاتر لەوەی من بریندار بکەن. هیچ شتیك من بریندار ناکات، نەمیلتۆس و نەئانیتۆس.. ئەوان ناتوانن، چونکە پیاوی خراپ 30dناتوانیت پیاویکی لەخۆی باشتر بریندار بکات. من نکولیی لەوە ناکەم کەرەنگە ئانیتۆس بتوانیت بیکوژیت، یاخود بەرەو تاراوگە رەوانەی بکات، یاخود لەمافە مەدەنییەکانی رووتی بکاتەوە، لەوانەشە وابزانیت، بگرە لەوانەیە خەلکانی تریش وابزانن، کەبەو کارە برینیکی گەورەی تیدەکات: بەلام لیرەدا من قایل نیم. چونکە ئەو چەشنە خراپەیەی



وەك ئـەوەی ئـەم دەیكـات.. لەخراپــەی نادادپــەروەریی گەورەتر نیە كەژیانی یەكیكی تر زەوت دەكات..

30eئیســـتاش، ئـــەی خـــەلكی ئەســـینا، مـــن بۆبەرژەوەندیی خۆم قسە ناكەم، كەرەنگە ئیوە وابیری لێ بكەنەوە، بەلكو لەبەر بەرژەوەندیی ئیوە دەدویم. چونكە ئەگەر ئیوە من بكوژن، بەئاسانی یـەكیك واتـان دەست ناكـەویت جیگـەی مـن بگریتـەوە، چونكـە مـن، ئەگـەر شـیوازیكی گالتەجارانـەی ئاخـاوتن بەكاربـهینم، مـن چەشنە میشـیكم و لەلایـەنی یەزدانـەوە بەخشـراوم بـەم شارە، شارەكەش ئەسپیكی رەسەن و چاكە، بەڵام بەهۆی قەبارە زەبەللاحەكەیەوە، بەخاوخلیچكیی دەجولیتەوەو، پیویسـتە بـەرەو ژیـان هـان بدریـت. مـن ئــەو میشــە ئەســپانەیەم كەیــەزدان نوســاندوویەتی بەشــارەكەوە، هەموو رۆژیك و لەهەموو شوینیك هانتان دەدەم، دنەتان دەدەم قایلتـان 31aدەكـەم و سـەركۆنەتان دەكـەم. ئیــوە بەئاسانی كەسیكی تری وەكو من نادۆزنـەوە، هەربۆیـە ئامۆژگاریتـان دەكەم كەبمهیلنــەوە. دەویـرم بلیـم رەنگـە هەست بەكەللەیی بوون بكـەن ( وەكـو كەسـیك لـەناكاو لەخەو راپـەریندرابیت)، بـیر لـەوە بكەنـەوە كەبەسـانایی بەرەو مـەرگم بنیرن، هـەروەكو ئـانیتۆس پیتـان دەلیـت، ئینجا ئەو ماوەیەی لەژیاننتان ماوتانـە، بچـن بنونـەوە،



تائـــەو کاتـــەی 31bیـــەزدان بەبـــەزەیی خـــۆی میشـــە ئەسپانەیەکی ترتان بۆ بنیریت. من کاتیك دەلیم یەزدان منی بەخشیوە بەئیوە، بەلگەی ئەرکەکەی من ئەمەیە: من ئەگـــەر وەکـــو پیـــاوانی تـــر وابوومایـــە، هـــەموو پیداویستییەکانی خۆمـم پشـتگوێ نەدەخسـت، یـاخود بـەدریژایی ئـەم هـەموو سـالانە، بەئارامـەوە سـەیری پشـتگوێ خرانیـانم نـەدەکرد، ، پیویسـتییەکانی ئیـوەم جیبـەجی نـەدەکرد، یـەك یـەك وەکـو بـاوکیك یـاخود برایەکی گەورە ، یەکەیەکە نەدەهاتم بۆ لاتان، بۆ ئەوەی ئامۆژگاریتان بکەم بەدوای چاکەدا بگەرین، من دەلیم ئەم کارە لەگەلّ سروشتی مرۆڤدا نایەتـەوە. ئەگـەر شـتیکم دەسـکەوتبیت، یـان ئەگـەر ئامۆژگارییـەکانم کرییـان هـەبووبیت، ئـەوا کارەکـەم ماقولییـەکی تیـدا دەبـوو، 31cبـەلام ئیسـتا وەکـو خۆشـتان دەیبینـن ، تەنانـەت تاوانبارکەرە بەدفەرەکانیشم نـاویرن بلیـن، مـن هـەرگیز کریم لەکەس سەندووە، یان داوام کردووە، چونکە هیچ بەلگەیەکیان بەدەستەوە نیە. بەلام مـن بەلگـەی تـەواوم هەیـە بـۆ راسـتیی ئـەوەی دەیلیـم .. کەئـەویش هەژارییەکەمە.

رەنگە یەکیك بپرسیت بۆچی مـن ئـاوا خۆبەخشـانە ئامۆژگاریی پیشکەش دەکەم و سەری خۆم خۆم بەکاری



خەلکەوە دەئیشینم، کەچی ناویرم بیمە پیشەوەو ئامۆژگاریی شارەکە بکەم. خۆم پیتان دەلیم بۆچی. ئیوە گویتان 31dلەمن بووە لەکاتی جیاجیادا لەشوینی جۆراوجۆر باسی سرووشیك یان ئاماژەیەکم کردووە، کەبۆم هاتووە، ئەوە لەیەزدانەوە بووە، کەمیلیتۆس لەتۆمەتەکەیدا بەگالتەپیکردنیان تاوانبارم دەکات. ئەم ئاماژەیە بریتیە لەدەنگیك، کاتیك بۆ یەکەمینجار هاتە بەر گویم، مندالْ بووم، ئەو دەنگە هەمیشە ریگرییم لیدەکات لەکردنی شتیك، بەلاْم هەرگیز فەرمانم پی نادات بەکردنی هیچ شتیك لەوشتانەی دەیانکەم. هەرئەمەش ریی لیگرتم لەوەی ببمە پیاویکی سیاسی. پیشم وایە شتیکی دروست بوو. چونکە، ئەی خەلکی ئەسینا، من دلنیام ئەگەر تیکەلاْوی سیاسەت ببومایە، ئەوا زۆر پیش ئیستا لەناوچووبووم، بەوەش هیچ شتیکی باشم نەکردبوو نەبۆ ئیوەو نەبۆ خۆم. 31eتووڕە مەبن لەوەی راستیتان پیدەلیم: چونکە راستی بریتیە لەوەی کەهیچ پیاویك لەوپیاوانەی لەگەلْ ئیوەدا، یاخود لەگەلْ هەر گرووپیکی تردا، دەچیت بۆ شەر، بەشیوەیەکی ئابڕوومەندانە دژی هەموو ئەوانە دەوەستیتەوە کە لەیاسا لایان داوە، دژی هەموو ئەو خراپانەی لەشارەکەدا کراون، لەبەرئەوەی ئەو لەپیناوی راستیدا



دەجەنگیت، تەنانەت ئەگەر 32aبۆماوەیەکی کەمیش بژی، ژیانی خۆی قوتار ناکات . چونکە دەیەویت پایەیەکی تایبەتی هەبیت نەك پایەیەکی گشتی.

من دەتوانم، دەربارەی ئەوەی دەیلیم، بەلگەی قایلکەرتان بدەمی. نەك بەقسە، بەلکو بەوەی ئیوە زیاتر بەلاتانەوە گرنگە..بەکردەوە. بوارم بدەن با بەشیك لەژیانی خۆمتان بۆ بگیرمەوە، کەبۆتان دەسەلمینیت من هەرگیز سەرم بۆ هیچ جەورو ستەمیك دانەنەواندووەو، لەمردنیش نەترساوم، ئەگەر دلنیاش بووبیتم لەوەی سەرپیچیکردن مردنیکی خیرای لەدوایە. چیرۆکیکی ناو دادگاتان بۆ دەگیرمەوە، رەنگە چیرۆکیکی زۆر دلخۆشکەریش نەبیت، 32bبەلام بیشك دروستە. ئۆ پیاوانی ئەسینا، تاکە پۆستیکی رەسمیی کەمن لەژیانمدا گرتبیتمە دەستم، بریتی بووە لەپۆستی سیناتۆریی. ئەوکاتەی هۆزی ئەنتیۆخیس کەهۆزەکەی منە، سەرۆکایەتی ئەو دادگاییکردنەیان گرتبووە دەست، ئەوەی بۆ ئەو جەنرالانە سازکرابوو کەلەشەری ئەرگینۆسدا جەستەی کوژراوەکانیان کۆنەکردبۆوە، ئیوە هەرهەمووتان پیشنیارتان کرد دادگایی بکرین، ئەمەش بەپیچەوانەی یاساوە بوو، هەروەك دواتر هەمووتان دەرکتان پیکرد، بەلام ئا لەوکاتەدا من تاکەکەس بووم

دژی ئەم رەفتارە نایاساییە وەستامەوە، دژی ئیوە دەنگم دا، کاتیکیش وتاردەرکان کردیانە هەرەشەو گورەشە بۆ زیندانیکردنی من، ئیوەش کردتان بەهات و هاوار، من بریاری خۆمم دابوو بەوەی لەسەر کارە پر مەترسییەکەم بەردەوام دەبم، 32cیاساو دادپەروەرییش پشتیوانم بوون، بۆئەوەی بەشداریی لەنادادپەروەرییەکەی ئیوەدا نەکەم، ئەوکاتە من نەلەزیندان ترسام و نەلەمەرگ. ئەمە لەرۆژانی دیموکراسییدا روویدا. وەلی کاتیک ئۆلیگارشییەکەی• سی ستەمکارەکە دەسەلاتیان گرتە دەست، ناردیان بەدوای من و چوار کەسی تردا تا بچین بۆ رۆتەندا•، لەویش داوایان لیکردین بچین بۆ

---

• ئۆلیگارشی Oligarchy لەفەلسەفەی سیاسییدا، بریتیە لەفۆرمیکی حکومەت کە تییدا دەسەلاتی بالا بەدەستی چەند نەفەریکی کەمەوەیە.نوسەرانی سیاسەتی دیرینی گریک ئەم وشەیەیان بەکارهیناوە بۆ ئەوەی جیای بکەنەوە لە فۆمی ئەریستۆکراسی، یاخود حکومەتیک کە باشترین دانیشتوانەکەی بەریوەی دەبەن. لە ئۆلیگارشیدا ، دەستەیەك حکومەت بەریوە دەبەن کە ئیش بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان دەکەن و دانیشتوانی حکومەتەکە لەخیرو چاکە بیبەش دەکەن.

• رۆتەندا (rotunda) لەبیناسازیی کلاسیکدا بریتیە لەبینایەکی بازنەیی یاخود هۆلیکی بازنەیی کەچواردەورەکەی بەچەند پایەیەك



سالامیس و لەوێ لیۆنی سالامیسیی دەستگیر بکەین، چونکە دەیانویست بیکوژن. ئەمە نمونەیەك بوو لەو فەرمانانەی کەئەوانە دەریان 32dدەکرد، لەتیروانینیکەوە کەبەشیوەیەکی ناراستەوخۆ ئاماژە بۆ تاوانەکانیان دەکات ، ئەوکاتە من تەنیا هەر بەقسە نا، بەلکو بەکرداریش دەرم خست، ئەگەر بوارم پیبدریت ئەم چەشنە گوزارشتە بکاربهینم، من بەقەدەر چلەپوشیك گوێ نادەمە مەرگ، تاکە شتیك کەبەلامەوە گرنگ بوو، ئەوەبوو کەکاریکی ناراست یاخود بەد ئەنجام نەدەم. دەسەڵاتی بەهیزی ئەم ستەمکارە زۆردارانە نەیترساندم و وای لینەکردم خراپە بکەم. کاتیکیش لەرۆتەندا هاتینە دەرەوە، چوارکەسەکەی تر چوون بۆ سالامیس و لیۆنیان دەستگیر کرد، بەڵام من بیدەنگ چوومەوە بۆ مالی خۆمان. ئەگەر دەسەڵاتی 32eئەو سی ستەمکارە کۆتایی پێ نەهاتایە، لەوانەبوو بەم کارە ژیانی خۆم لەدەست بدەم. زۆرکەسیش شایەتی قسەکانمن.

ئیستا ئیوە بەراستی پیتان وایە کەئەگەر لەژیانی گشتییدا بەشدارییم بکردایە، ئەم هەموو ساڵە،

---

دەگیراو لەسەریانەوە قوببەیەك دروست دەکرا. گرکە کۆنەکان ئەم بینا بازنەییەیان بەکاردەهینا بۆ کۆبوونەوە گرنگەکانیان.



بەزیندوویی دەمامەوە، بەگریمانەی ئەوەی کەمن وەکو پیـــاویکی بـــاش هەمیشـــە بەتـــەنگی راســـتیی و دادپەروەییەوە بووم، هەروەکو لەیەکەمین کارمدا کردم؟ بیگومان نا، پیاوانی ئەسینا، نەمن و 33aنەهیچ پیاویکی تریش. من هەمیشە لەهەموو کردەوەیەکمدا هەمان کـەس بـووم، چ کردەوەیـەکی گشـتی بووبیـت و چ تایبـەتی، هەرگیز بنەمای پیرەویکردنم بۆ هیچکام لەوانە دانەناوە کەبـەدرۆوە پییـان دەلیـن قوتابییـەکانی مـن، یـان هەرکەسـیکی تـر. مـن هـەرگیز بەشـیوەیەکی ریکوپیـك قوتابییم نەبووە. بەلأم هەرکەسیك حەزبكات بیت و گوی لـەمن بگریـت، لـەکاتیکدا مـن دوای کارەکـانی خـۆم کەوتووم، چ لاو بیت یان پیر، هـەرگیز 33bدەستم نەناوە بەروویـەوە. مـن تـەنیا لەگـەلْ ئـەو کەسـانەدا دەمەتـەقیم نـەکردووە کـەپارە دەدەن، بـەلکو لەگـەلْ هەرکەسـیکدا بووبیت، چ دەولەمەند بیت یـان هـەژار، هـەموو کەسـیك بـۆی هەیـە پرسـیارم لیبکـات و وەلأمـم بداتـەوەو گـویٚ لەقسـەکانم بگریـت، چ پیـاویکی بـاش دیـاربووبیت یـان خـراپ، ئـەوە بـەلای منـەوە گرنـگ نـەبووە، چونکـە مـن هـەرگیز کەسـم فـیر نـەکردووەو پسـپۆریش نـەبووم لەفیرکردنی هیچ شتیکدا. یان ئەگەر هەرکەسیك بلیـت کەجاریکیان بەشیوەیەکی تایبەتی و بیٚ ئەوەی کەسـی

تر گویی لێ بووبێت، ئەو شتێك لەمنەوە فێر بووە، یان گوێی لێ بووە، ئەوا ڕێگەم بدەن پێتان بڵێم ئەو کەسە درۆ دەکات.

بەڵام ڕەنگە لێم بپرسرێت، بۆچی خەڵك حەزیان لەوەیە دەمەتەقێ 33cلەگەڵ تۆدا بکەن؟ ئەوا ئەی خەڵکی ئەسینا، من پێشتر هەموو ڕاستییەکەم لەم بارەیەوەپێ وتوون: ئەوانە حەزدەکەن گوێیان لەلێپرسینەوەی ڕووبەڕووی ئەو کەسانە ببێت کەلافی دانایی لێدەدەن، ئەمە جۆرە چێژو خۆشییەکی تێدایە. ئێستا ئەم ئەرکی لێپرسینەوە ڕووبەڕووەی خەڵکانی تر، لەلایەنی یەزدانەوە خراوەتە ئەستۆی من، بەهۆی سروش و زەینەوە، نێردراوە بۆ من، یان بەهۆی هەر ڕێگایەکی ترەوە کەبشێت لێوەی دەسەڵاتی یەزدانیی لەکەسێك نزیك دەبێتەوە. ئای خەڵکی ئەسینا، ئەمە ڕاستە، یاخود ئەگەر ڕاست نەبێت، ئەوا بەم نزیکانە بەرپەرچی دەدرێتەوەو 33dبەدرۆ دەخرێتەوە. ئەگەر من هەرکاتێك بووبێتمە هۆی بەدخووکردنی لاوان، ئەوا ئەو پیاوانەی کەئێستا گەورە بوون و وایان لێهاتووە دەتوانن دەرك بەوە بکەن من لەلاوییاندا ئامۆژگاریی خراپم کردوون، بابێنە پێشەوەو تاوانبارم بکەن و، تۆڵەی خۆیانم لێ بکەنەوە، یاخود ئەگەر حەزناکەن خۆیان بێنە پێشەوە،



با یەکیك لەخزمەکانیان، باوکیان، برایان، هەر خزمیکی تریان، بین وبلین کەخیزانەکانیان بەدەستی من تووشی چ خراپەیەك هاتوون. ئیستا 33eکاتی ئەوانە. من زۆریك لەوانە لەدادگادا دەبینم. ئەوە کریتۆیە، هاوتەمەن و هاوشاریی خۆمە، هەروەها ئەوە کریتۆبلۆسی کوریتی، ئەویش دەبینم. هەروەها ئەوە لیسانیاسی سفیتۆسییە، باوکی ئەسخینیەسە.. ئەویش لیرەیە، هەروەها ئەنتیفۆنی کیفیسۆسیش لیرەیە، کەباوکی ئیپیگنیسە، هەروەها برای شەش حەوتیك لەوانەی لەگەڵ مندا مامەلەیان کردووە، لیرەن. ئەوە نیکۆستراتۆسی کوری سیۆسدۆتیدس و برای سیۆدۆتوسە ( ئیستا سیۆدۆتوس خۆی مردووە، بۆیەشە لەهیچ حالەتیکدا هەوڵ نادات بۆ راوەستاندنی ئەو). ئەوەش پارالوسی کوری دیمۆدۆکوسە، 34aکەبرای سیاگیس و ئەدیمانتۆسی کوری ئەریستۆنە، کەئەفلاتونی براشی لیرەیە، ئاینتۆدۆرۆس کەبرای ئەپۆلۆدۆرۆسە، کەئەویش دەبینم. دەتوانم ئاماژە بۆ ژمارەیەکی زۆری تریش بکەم، کەمیلیتۆس دەتوانیت هەندیك لەوانە وەکو شایەت بەکاربهینیت بۆ پشتگیریی قسەکانی، ئەگەر لەبیری چوون، با بەکاریان بهینیت.. من خۆشم ریگای بۆ خۆش دەکەم. دەبا بلیت هیچ پشتیوانیکی هەیە. نەخیر، ئەی



ئەسینییەکان، بەلکو تەواو پیچەوانەکەی راستە. چونکە هەموو ئەوانە ئامادەن شایەتی بۆ بەدخووکەرەکە بدەن، ئـەو 34bکەسـەی خزمـەکانیانی بینـدار کـردووە، وەك میلیتـۆس و ئـانیتۆس وام پیدەلیـن، نـەك بەتـەنیا لاوە بـەدخووکراوەکان.. کـەریی تیدەچیـت شـتیکی وا روویدابیـت.. بـەلکو خزمـە گـەورەترە بـەدخوو نەکراوەکانیشـیان. بۆچـی ئەوانـە خۆیـان پشـتی مـن دەگرن؟ لەراستیدا، لەبەر خاتری راستی و دادپەروەرییە، لەبەرئەوەیـە کەئـەوان دەزانـن مـن راسـتی دەلیـم و، میلیتۆسیش درۆ دەکات.

باشـە، ئـەی ئەسـیناییەکان، ئەمـەو شـتی تـری لـەم شیوەیە، تاکە داکۆکییە کەمن لەخۆمی بکەم. یەك قسـەی تریش دەکەم. رەنگە یەکیك قینم لی هەلبگریت، کاتیك بیر دەکاتەوە کەچۆن خۆی لەبۆنەیەکی هاوشیوەدا، یاخود لەمـە کـەمتر مەترسـیداردا، چـۆن بەفرمیسـکی زۆرەوە لەدادوەران 34cپاراوەتـەوەو نـزای کـردووە، منداڵـەکانی خۆی هیناوە بۆ دادگاو لـەپاڵ کەسو کارو هاوریکانیدا، لەدیمەنیکی سۆزئامیزدا بەکاری هیناون، کەچی من کە بەراستی ژیانم کەوتۆتە مەترسییەوە، هیچ شتیك لەوانە ناکەم. رەنگە ئـەم جیاوازییـە ببیتـە بیرییـەوەو، دەشـیت بەوەش دژم بوەستیتەوەو، بەتورەیی دەنگی خۆی بدات،




چونکە لەم بارەیەوە خۆشیی بەمندا نایەت. ئیستا ئەگەر 34dکەسیکی وا لەناوتاندا هەبیت.. نالیم کەسی واتان تیدایە.. بەدادەوە پیی دەلیمەوە: هاوریم، من مرۆڤم، بۆیە وەك مرۆڤەکانی تر، بونەوەریکم لەخوین و گۆشت، نەك تەختە یان بەرد، وەکو هۆمیرۆس دەلیت، من خیزانیکم هەیە، بەلی، چەند کوریکیشم هەیە، ئۆ، ئەسینییەکان، ژمارەیان سیانە، یەکیکیان پیاوە دوانەکەی تر هیشتا مندالن، بەلام من هیچ کامیان 34eناهینم بۆ ئیرە، بۆ ئەوەی داوای بەخشینتان لی بکەن. بۆچی نا؟ نەك لەبەرئەوەی زۆر بەخۆم دەنازم یان ریز لەئیوە ناگرم. مەسەلەی ئەوەی من لەمردن دەترسم یان نا، ئەمە پرسیاریکی ترە، کەئیستا قسەی لەسەر ناکەم، بەلام من ریزم هەیە بۆ ئیرادەی گشتی، پیموایە کاریکی ئاوا، زیان بەشکۆی خۆشم و بەئیوەش و بەهەموو شارەکەش دەگەیەنیت. یەکیك گەیشتبیتە ئەم 35aتەمەنەی من و، شۆرەتی بەدانایی دەرکردبیت، پاشتر وایە خۆی سووك نەکات. جا چ ئەگەر شایستەی شۆرەتەکە بم یان نا، جیهان بریاری داوە کەسۆکرات بەشیوەیەك لەشیوەکان لەپیاوانی تر جیاوازە. جا ئەگەر ئەوانەی لەنیوان ئیوەدان و دەلین لەدانایی و ئازایەتیی و چاکەکانی دیکەشدا نائاساییی بن، ئاوا بەمجۆرە



خۆیان سووك بكەن، دەبی كردەوەكەیان چەند شەرمندە بیــت! مــن پیــاوانیكی نیــودارم بینیــوە، كـــاتیك تاوانباركراون، بەشیوەیەكی زۆر سەمەرە رەفتار دەكەن، وادیـارە ئەوانـە ئەندیـ شـەی ئـەوەیان كـردووە كەئەگــەر بمرن تووشی شتی تۆقینەر دەبن، ئەگەر لیشیان بگەرین بژیـن، ئەوا نـەمر دەبن و نـامرن. مـن پیموایـە ئـەو جـۆرە كەسانە مایەی شەرمەزاریین بۆ 35bشارەكە، ئەگەر هـەر كەسـیكی نـامۆ بیتــە ژوورەوە، دەلیــت كـــەناودارترین پیاوانی ئەسینا، ئەوانەی ئەسینییەكان خۆیان شـكۆو سەروەریان پیدەبەخشن، ئەوانە لەئافرەت باشتر نین. مـن دەلیم نابیت ئەم شتانە لەلایەنی ئەو كەسانەی ئیمـەوە بكریـن كەشـۆرەتیان هەیـەو ناسـراون، ئەگـەر ئـەوانیش بیكەن، ئەوا نابیت ئیوە ریگـەیان پیبـدەن، ئیـوە باشـتر وایـە پیشـانی بـدەن زیـاتر مـەیلتان لەوەیـە ئەوپیاوانـە تاوانبـار بكـەن كــە دیمــەنیكی دزیــو پیشــان دەكــەن و شارەكە دەكەنە مایەی گالتە پیكردن، زیاتر لـەوەی ئـەو بەدوای سەلامەتی خۆیدا دەگەریت.

35cبەڵام با رای گشتی بخەینـە لاوە، وادیـارە شـتیك هەلـەبیت لـەداواكردنی چاكـە لەدادوەریكـەوە، بـەوەش داواكردنــی بەخشـین، لــەبری ئـەوەی تیــی بگەیــەنیت و قــایلی بكــات. چونكــە ئــەركی ئــەو ئــەوە نیـــە كـــە



دادپەروەریی بەریوە ببات، بەڵکو ئەوەیە بریاریك بدات، بەڵام ئەو سویندی خواردووە کەبەپیی یاساکان بریار بدات، نەك بەپیی چیژو لەزەتی تایبەتی خۆی، ئیمەش نابیت دنەی ئیوە بدەین کە وابکەن، هەروەها نابیت ئیوەش ریّ بەخۆتان بدەن کەتاو بدرین، لەم حالەتی لەخشتە بردنەدا.. دەشیّ هیچ شکۆیەکی تیدا نەبیت. کەواتە داوای شتیکم لیّ مەکەن کەپیموایە ئابرومەندانە نیەو هەلەو ناپاکە، بەتایبەتی ئیستا، کەهەولمداوە تۆمەتە دزیوەکەی میلیتۆس رەت بکەمەوە. چونکە ئەگەر، ئۆ، پیاوانی ئەسینا، ئەگەر من بتوانم بەهیزی قایلکردن و پارانەوە، سویندەکەی ئیوە بەتالّ بکەمەوە، ئەوا من 35dفیرتان دەکەم باوەر بەوە بکەن کەهیچ خودایەك لەئارادا نیە، هەروەها لەداکۆکییەکەشمدا بەسانایی لەسەر خۆمی ئیسپات دەکەم کەهیچ باوەرم پییان نیە. بەڵام ئەمە وانیە.. بگرە زۆر بەپیچەوانەوە. چونکە من بروام بەبوونی خوداکان هەیە، هەروەها لەهەستیکی بالاّتر لەوەی کەهەریەکیك لەتاوانبارکەرەکانم باوەریان پییانە. من مەسەلەکەم دەخەمە بەردەمی ئیوەو یەزدان. تا بەوشیوەیە بایەخی پیبدەن کە بۆ ئیوەش و بۆ منیش باشترە.

35eپیاوانی ئەسینا، گەلیك هۆ هەیە بۆ ئەوەی بۆچی من خەمبار نیم، بەدەنگدانی تاوانبارکردنم. من پیشبینی ئەمەم دەکرد، بەلاّم تەنیا لەوە سەرم 36a سورماوە کەدەنگەکان نیمچە یەکسان بوون. چونکە من وای بۆدەچووم کەزۆرینەی دژی من زۆر لەوە گەورەترە، کەچی ئەوە تەنیا سی دەنگ بەلای لایەنەکەی تردا چووە، یەك تۆزی مابوو تەبرییە بکریم، دەتوانم بلیم، لەو بروایەدام من لەمیلیتۆسم بردۆتەوە. دەشیت زیاتریش بلیم، دەشیت هەموو کەسیك ئەوە ببینیت کەبەبێ هاوکارییەکەی ئانیتۆس و لیکۆن، میلیتۆس 36bپینج یەکی دەنگەکانی نەدەهینا، وەکو یاسا داوا دەکات، بەوەش دەبوو سزا بدرایەو هەزار دراخمای لی بستینرایە.

هەربۆیەشە ئەو داوای سزای مەرگ بۆ من دەکات. ئەی دەبیت من لەلای خۆمەوە چی هەلببژیرم، ئۆ، پیاوانی ئەسینا؟ بیشك ئەوە هەلدەبژیرم کەبەگونجاوی دەزانم، چی بۆ من گونجاوە؟ لەبەرامبەریشدا دەبیت چی بکریت لەگەڵ پیاویکدا کە بەدریژایی ژیانی خۆی لەوەدا سەرکەوتوو نەبووە کەخۆی بەگەمژە لەقەلەم بدات، پیاویك کەگویی نەداوەتە ئەوەی کەزۆرینەی خەلك بایەخی پیدەدەن.. واتە سەروەت و سامان و بەرژەوەندنیی خیزانیی و، لەگەڵ پلەوپایە



سەربازییەکانیشـدا، هـەروەها ئاخـاوتن لـە ئەنجومـەن و 36cدەســـتەی دادوەرانـــدا، پیـــلان گـــیران و پـــارت و ریکخراوەکـان. هـەرکاتیك دیتـەوە بـیرم کـەمن بەراسـتی لـەوە ئابروومـەندتر بـووم کـەببم بـەپیاویکی سیاسـی و بشتوانم بەردەوامی بەژیانم بدەم، من هەرگیز نـەچووم بـۆ شـوینیك کـەبتوانم شـتی خـراپ بـۆ ئیـوە یـان بـۆ خـۆم ئەنجام بدەم، بەلاّم لەهەرشوینیك توانیبیتم خۆبەخشانە باشترین چاکە لەگەلّ هەریەکیك لەئیوە بکەم، ئەوا چووم، بـەنیازی قـایلکردنی هـەموو پیـاویك لـەنیوانی ئیـوەدا، کەپیویسـتە بروانیتـە خـۆی، هـەروەها بـەدوای چاکـەو دانـاییدا بگـەریت پیـش ئـەوەی بـەدوای بـەرژەوەندیی خۆیدا بگەریت، هـەروەها سـەیری شـارەکە بکـات پیـش ئـەوەی بروانیتـە بـەرژەوەندیی شـارەکە، هـەروەها ئەمـە پیرەوی بیت لەهەموو 36dکردەوەکانیدا. دەتوانریت چی لەگـەلّ کەسـیکی ئـاوادا بکریـت؟ بیشـك هـەندیك شـتی بـاش، ئۆ، پیاوانی ئەسینا، ئەگـەر ئـەو پاداشـتی خـۆی وەرگرت، ئەوا پیویستە پاداشتەکە لـەو جۆرە بیت کـەبۆ ئەو بگونجیت. پاداشتی ئـەو پیـاوە هـەژارە چـی دەبیـت کەچاکـەی لەگـەلّ ئیـوە کـردووەو حـەزی لـەکاتی زیـاترە بۆئـەوەی وانـەتان پـیّ بلیتـەوە؟ هیـچ پاداشـتیك نیـە بەقەدەر ئەوە بۆی گونجاو بیت کەلەناو ئەنجومەنی گەلدا



بمینیتەوە، ئۆ، پیاوانی ئەسینا، ئەو پاداشتەی کەئەو، زیاتر لەو هاوشارییەی کەلەپێشبرکیی ئەسپ یاخود 36eگالیسکەدا، گالیسکەی دوو ئەسپی یان زیاتر، خەڵاتی ئۆلیمپیادی بردۆتەوە، شایستەیەتی . چونکە من دەسکورتم و ئەویش بەشی خۆی هەیە، ئەو تەنیا بەروکەش شادمانیتان پیدەبەخشیت، من شادیی راستەقینەتان پیدەبەخشم. هەروەها ئەگەر بۆم هەبوایە خۆم سزایەکی دادپەروەرانە بۆخۆم هەلبژیرم، ئەوا دەمووت بابریتی بیت لەمانەوە لەئەنجومەنی گەلدا.

37aرەنگە ئیوە پیتان وابیت، من بەوەی دەیلیم، کیبەرکیی ئیوە دەکەم، وەکو چۆن پیشتر دەربارەی پارانەوەو گریان وتم. بەڵام ئەمە وانیە. من تارادەیەك قسە دەکەم چونکە من دلنیام لەوەی من بەئارەزوو کەسم بەهەلە دانەناوە، گەرچی ناتوانم ئیوە قایل بکەم.. کاتەکە زۆر کورتە، ئەگەر 37bیاسایەك هەبیت لەئەسینا، وەك ئەوەی لەشارەکانی تر هەیە، کەبریاری کوشتن لەیەك رۆژدا نەدرایە، ئەوا من لەو بروایەدام کەدەمتوانی قایلتان بکەم. بەڵام ناتوانم لەساتیکدا بوختانیکی گەورە رەت بکەمەوە، من کە باوەرم وایە قەت خراپەم لەگەڵ کەسدا نەکردووە، ئەوا هەرگیز خراپە لەگەڵ خۆمدا ناکەم، دەربارەی خۆم نالیم من شایستەی هەموو



خراپەیەکم، یاخود پێشنیاری هیچ سزایەك ناکەم. بۆچی بیکەم؟ لەبەرئەوەی من لەو سزای مەرگە دەترسم کە میلیتۆس داوای دەکات؟ لەکاتیکدا من خۆشم نازانم ئایا مەرگ باشە یان خراپە، بۆچی سزایەك بۆخۆم هەلبـبژێرم کە خراپ بێت؟ بلیم 37cزیندانیم بکەن؟ جا بۆچی لەزینداندا بژیم و بم بەکۆیلەی دادوەرەکەی ساڵ .. هی یازدەیەمین؟ یان سزاکە ببێتە غەرامەکردن و، زیندانیکردن هەتا غەرامەکە دەدرێت؟ بۆ ئەمەش هەمان نارەزاییم هەیە. دەبێت لەزینداندا لیی بکەوم، من خۆم پارەم نیەو، ناتوانم بیدەم. هەروەها ئەگەر بلیم دوورخستنەوە( رەنگە ئەمە ئەو سزای بێت کەئیوە پەسەندی دەکەن)، ئەوا دەبێت خۆشەویستی ژیان کویری کردبم، ئەگەر ئەوەندە کەم هۆش بم کە پێشبینی بکەم کە لەکاتیکدا ئیوەی هاوشاریی خۆم، ئاخاوتن و وشەکانی 37dمنتان پێ قووت ناچێت و بەلاتانەوە ئەوەندە مەترسیدارن کەهیچی زیاترتان لیی ناوێت، خەلکیکی تر هەبن، بەرگەم بگرن. نەخێر، بەراستی، پیاوانی ئەسینا، ئەمە شتێکی زۆر باش نیە. جا من بەم تەمەنەوە دەبێت چۆن ژیانێك بەسەر ببەم، لەشارێکەوە رەو بکەم بۆشارێکی تر، بەردەوام شوێنی تاراوگەیم بگۆرم، هەمیشە شاربەدەر بکرێیم! چونکە من بەتەواویی

لەوە دلنیام کەبۆ هەر شوینیك بچم، لەویش وەکو ئیرە، لاوان دەورم دەدەن، 37eئەگەر لەخۆمیان دوور بخەمەوە، ئەوا پیرەکان دەرم دەکەنە دەرەوە، ئەگەر لیشیان بگەریم بین، باوکانیان و هاوریکانیان بۆ پاراستنی خۆیان وەدەرم دەنین.

رەنگە یەکیك بلیت باشە سۆکرات، ئەی ناتوانیت زمانت بگریت، ئیتر رەنگە بتوانیت بچیتە ناو شاریکی بیانییەوە، کەسیش خۆیت تیهەلنەقورتینیت؟ لیرەدا زۆر بەنارەحەتیی دەتوانم وەلامی ئەم پرسیارەتان تیبگەیەنم. چونکە ئەگەر پیتان بلیم، ئەگەر وەك ئیوە دەلین، ئاوا بکەم، ئەوە دەبیت بەسەرپیچیکردن لەیەزدان، بۆیە ناتوانم زمانم بگرم، ئیوە باوەر 38aناکەن کەمن بەراستمە، کەئەگەر دیسان بلیمەوە دەمەتەقیی رۆژانەی من دەربارەی چاکەو، ئەو شتانەی تریش کەگویتان لیم بووە خۆشم و خەلکیشم دەربارەیان تاقیکردۆتەوە، باشترین چاکەی مرۆڤە، چونکە ژیانیکی تاقینەکراوە شایستەی بەسەربردن نیە، ئیوە هیچ شتا کەمتر ئارەزوو دەکەن باوەرم پیبکەن. بەلام من ئەوەی راستە دەیلیم، تەنانەت ئەو شتەش کەزەحمەتە بتوانم قایلتان بکەم پیی. هەروەها، من هەرگیز رانەهاتووم کەبیر لەوە بکەمەوە کەمن شایستەی چەشتنی هیچ ئازاردانیکم. ئەگەر



پارەیـەکم هەبوایـە، رەنگـە سـزاکەم بـەپارە بقەبڵاندایـە بەوەی چەند دەتـوانم بدەم و هیـچ 38bبەلاشمـەوە گرنـگ نەدەبوو. بـەڵام نیمـە، بۆیـە پیویسـتە داوا لـەئیوە بکـەم کەبەشـداریی بکـەن لـەبژاردنی مینایـەکانمندا. باشـە، رەنگە بتوانم یەك مینای پەیدا بکەم، بۆیە پیشنیاری ئەم سزایە دەکەم: ئەفلاتون، کریتـۆ، کریتۆبولـوس، هـەروەها ئەپۆلۆدیرسیش، هاوریکانم لیرەن، داوام لیدەکـەن بلیـم سی مینـای، ئـەوان زامنـم دەکـەن. باشـە با سـزاکە سـی مینـای بیـت، ئەمـە بـرە 38cپارەیەکـە ئـەوان دەتوانـن بەسانایی پەیدای بکەن.

ئۆ، ئەسینییەکان، ماوەیـەکی زۆرتـان پـێ نـاچیت و، ئەو نازناوو شۆرەتە خراپانە پەیدا دەکەن کە لەلایـەنی زمانبـەدەکانی شـارەوە پیتـان دەبەخشـرین، ئەوانـەی دەلین ئیوە سۆکراتتان کوشت، پیاوە داناکەتان کوشت، چونکە ئەوان کاتیك دەیانەویت سەرکۆنەی ئیـو بکـەن، دین من بـەدانا دادەنیـن، تەنانـەت ئەگـەر دانـاش نـەبم. ئەگـەر ئیـوە توزیـك ئارامتـان بگرتایـە، ئارەزووەکانتـان بەشـیوەیەکی سروشـتیی دەهاتنـە دیـی. چونکـە وەك خۆشـتان دەتوانـن سـەرنجم بـدەن، مـن چوومەتـە نـاو سـالەوەو، زۆر لەمردنـەوە دوور نیـم. مـن ئیسـتا بـۆ هـەمووتان قسـە ناکـەم، بـەلکو تـەنیا ئەوانـەی حوکمـی



مەرگیان 38dبەسەردا داوم. هەروەها شتیکی تریشم هەیە پییان بلیم: ئیوە پیتان وابووە کەمن تاوانبارم لەبەرئەوەی من قسەی وام پی نیە لەوچەشنە قسانەی کەدەیانتوانی تەبرییەم بکەن.. مەبەستم، من ئەگەر بیرم لەوە بکردایەتەوە هیچ شتیك بەنەکراویی یان نەوتراووی نەهیلمەوە. نەك هەرئەوەندە، بەلکو ئەو ناتەواوییەی ئیوەی هان دا بۆ تاوانبارکردنم، بەهۆی وشەکانەوە نەبوو.. بیشك نا. بەلاّم من ئەوەندە جەسور یان رووقاییم یان مایل نەبووم، بەوشیوەیە لەگەلتان بدویم کەخۆتان حەزتان دەکرد بیکەم، بگریم و 38eبلالیمەوەو لەدەورتان بگەریم، زۆر شتی ترم بووتایەو بکردایە لەوانەی کەئیوە راهاتوون لەخەلکی ترەوە بیانبیستن، ئەوانەی کەمن پیموایە بۆ من لایەق نین. من وام هەست کرد نابیت شتتیکی ئاوا بکەم، یاخود لەکاتی مەترسییدا پەشیمان ببمەوە: هەروەها پەشیمانیش نیم لەو شیوازەی لەداکۆکیکردنەکەمدا گرتمە بەر، من وام پیباشترە بەشیوازەکەی خۆم بدویم و 39aبمرم، نەك ئەو شیوازەی ئیوە بەکاربهینم و بژیم. چونکە نابیت، نەلەجەنگ و نەلەبەردەمی یاساشدا، نەمن و نەهیچ پیاویکی تر، هەرچی ریگا هەیە هەموویان بگریتە بەر بۆ ئەوەی خۆی لەمردن رزگار بکات. ئەگەر لەجەنگدا، جەنگاوەریك



چەکـــەکانی خـــۆی فـــڕێ بـــدات و لەبـــەردەمی ڕاوەدوونـەرەکانیدا بکەویتـە سـەرچۆك، ئـەوا بـەزۆریی لـەمردن ڕزگـاری دەبیـت، هـەروەها لەمەترسـی تریشـدا ریگای تر هەیە بۆ ڕزگاربوون لەمردن، ئەگەر پیاو هەموو شـتیك بلیـت و هـەموو شـتیك بكـات. هاوڕییـانم، ناخۆشـییەکە، ئەوەنیـە 39bکـەخۆت لـەمردن لابدەیـت، بەلکو ئەوەیە خۆت لەراستی و دروستیی لابدەیت. مـن پیرم و بەهیواشـی دەبزویمـەوە، خـاوترین غـاردەر پیشـم کەوتۆتـەوە، تاوانبارکەرانیشـم بزیـوو خـیران، خـیراترین غـاردەریش کـەپیش ئـەوانیش کەوتۆتـەوە بریتییـە لەدزیویی. ئیسـتاش من لەلایـەنی ئیوەوە تاوانبـارکراوم دوور دەکەومـەوە تاکو سـزای مـەرگ بچیـژم.. ئـەوانیش هەردوکیان بەریی خۆیاندا دەڕۆن و لەلایـەنی ڕاستییەوە تاوانبـارکراون تـا سـزای نزمـی و هەلـەیی بچیـژن، پیویسـتە مـن پابـەندی سـزاکەی خـۆم ببـم.. بائـەوانیش پابـەندی سـزای خۆیان ببن. پیموایـە دەبیت ئـەم شـتانە بـەچارەنوس لەقەلـەم بدریـن.. پیشـموایە کـە ئەمـە شتیکی باشە.

39cئیسـتاش، ئۆ ئـەو پیاوانـەی منیـان تاوانبـارکرد، بەخۆشـحالییەوە پیشـبینییەکەی خۆمتـان پیشـکەش دەکـەم، مـن هینـدەم نـەماوە بمـرم، لەسـاتی مردنیشـدا،



مــرۆڤ توانــای پیشــبینیکردنی پیدەدریــت. منیــش پیشبینی دەکەم بۆ ئیوە کەبکوژانی منـن، یەکسـەر دوای ئەوەی من لەسزاکەی خۆم تیدەپـەرم، زەبریکـی لـەوەی ئیـوە لـەمنتان وەشـاند، سـەختتر چـاوەریی خۆشــتان دەکــات، ئیــوە منتــان کوشــت، بۆئــەوەی خۆتــان لەتاوانبارکەرەکانم قوتار بکەن، بەلام هیچ حیسابیکتان بۆ ژیانی خۆتان نەکرد. مەسەلەکە بەو شیوەیە نـابیت 39dکەئیوە بۆی دەچن: بەپیچەوانـەوە زۆر دوور نـابیت. چونکـە مـن دەلیـم ئەوانـەی ئیـوە تاوانبـار دەکــەن، لەتاوانبارکـەرانی مـن زۆر زیـاتر دەبـن، تاوانبارکـەرانیك کەتائیستا من کۆنترۆلم کـردوون و دام مرکاندونەتـەوە: ئەوان گەنجترن ، بۆیە لەگەلتانا هەلەشـەتر دەبـن، ئیـوە لەلایەنی ئەوانەوە ئازاری زیاترتان پیدەگات. ئەگەر ئیوە پیتـان وابیـت بەکوشـتنی مـن دەتوانـن کەسیك قەدەغـە بکەن لەوەی سەرکۆنەی ژیانە دزیوەکەتان بکـات، ئـەوا بەهــەلدا چــوون. چونکــە ئــەوە ریگەیــەکی شــیاوو شەرەفمەندانە نیە بۆ هـەلاتن، ئاسـانترین و خانـەدانترین ریگــا بریتــی نیــە لــەبیتواناکردنی ئــەوانیتر، بــەلکو 39eبریتیــە لــەوەی خۆتــان بــاش بکــەن. ئەمــە ئــەو پیشبینییەیە کەپیش ئەوەی بچمە دەرەوە، دەربارەی ئەو دادوەرانەی کەمنیان تاوانبار کرد، دەیلیم.



ئیوەش هاوریـان، ئـەی ئەوانـەی منتـان بـەبێ تـاوان لەقەلـەمدا، حەزدەکـــەم قســـەیەکیش بـــۆ ئیـــوە بکـــەم، دەربارەی ئەوشتەی کەکاتیك دادوەرەکان سـەرقاڵ بوون، هاتن بۆئەوەی تیبپـەرن، هـەروەها پیش ئەوەی بچـم بـۆ ئەو 40aشوینەی، کەپیویستە لیی بمـرم. بۆیـە ئیـوەش تۆزیك بمیننـەوە، چونکـە لەوانەیـە ئەگـەر کـات هـەبیت بەیەکـەوە قسـە بکـەین. ئیـوە هـاوریی منـــن، منیـش پیمخۆشـە مانـای ئـەم روداوەتـان پیشـان بـدەم، ئـەوەی لەگـەڵ منـدا روویـــدا.. ئـۆ، دادوەرانم چونکـە رەنگـە بەراستی بەئیوە بلیم دادوەر، حەزدەکەم باسی حالەتیکی دلگیرتـان بـۆ بکـەم، هـــەتا ئیســـتا توانـــای یـــەزدانیی کەبەشـــیوەیەکی جیگیرانـــە لـــەچاوگی سرووشـــە ناوەکییـەکاندا منـی گرتۆتـە خـۆی تەنانـەت لەگالتـەو گەپەکانیشمدا، من ئەگەر لەوانـە بوایـە لەشـتیکی تـردا هەلـەم بکردایـە یـان پیـم هەلبکەوتایـە. ئیسـتاش وەکـو دەبینن، ئیستا ئـەوەم بەسـەرهاتووە 40bکەرەنگە بـەبیردا بهاتایـە، هـەروەها بەشـیوەیەکی گشـتی رەنگـە ببیتـە دوایـین و بـەدترین خراپـە، بـەڵام سرووشـــەکە ئامـاژەی نـــەکردووە بـــۆ نـــارەزایی. تەنانـــەت ئەوکاتەشـــی کەسەرلەبەیانی مالەکەمم جیدەهیشت، یاخود کەبەریوە بـووم بـەرەو دادگـا، یـاخود لەوکاتـەدا کەقسـەم دەکـرد،

دەربارەی هەرشتیك كە خەریك بووە بیلیم، هەروەها لەوكاتەشدا كەلەناوەراستی قسەكانمدا راوەستینراوم. بەلام ئیستا لەهیچ یەكیك لەوشتانەدا كەوتوومن، بەلام ئیستا لەهیچكام لەوانەی وتومە یان كردوومە، شتیكی تیا نیە كەسرووشەكە دژم 40cبووبیت. چ شتیك وەربگرم تا ببیتە روونكردنەوەی ئەم بیدەنگییە؟ پیتان دەلیم. ئەمە نیشانەیەكە بۆ ئەوەی چیم بەسەر هاتووە، باش بووە، هەروەها ئەوانەی لەئیمە وادەزانن كە مردن خراپە، بەهەلەدا چوون. چونكە بەدلنیایی ئەگەر بەرەو خراپە بچوومایە نەك چاكە، دژم دەوەستایەوە.

با بەریگایەكی تر باسی بكەین، دەبینین هۆیەكی گەورە هەیە كەبەهیوابین مردن باش بیت نەك خراپ، چونكە بۆ یەكیك لەدوو شت.. یان 40dئەوەتا حالەتیكی هیچیی بیت یان لەهۆش خۆچوونیك بیت، وەك خەلك دەلین، گۆرانیك و كۆچكردنیكی رۆح هەیە لەم جیهانەوە بۆ جیهانیكی تر. ئیستا ئەگەر ئیوە گریمانە بكەن لەوی هیچ بیدارییەك نییە، وەكو نوستنی ئەو پیاوەی كەخەونی ناخۆش نارەحەتی ناكات، ئەوا بەبێ قسە، مەرگ قازانج دەبیت. چونكە ئەگەر یەكیك بیت و شەویك دیاریی بكات كەتییدا نوستنەكەی تەنانەت بەخەوبینینیش نەشیوینریت، ئینجا بیت بەراوردی

بكات بەرۆژو شەوەكانی تری ژیانی خۆی، ئینجا پیمان بلیت كەلەژیانیدا چەند رۆژ و چەند شـەوی لـەو شـەوە خۆشـتری هــەبووە، پیموایــە هــەر پیـاویك، مــن نــالیم 40eكەسـیكی دیـاریكراو، بــەلكو تەنانــەت پادشــای گــەورەش شــەو یــان رۆژی لەوبابەتــەی زۆر دەســت ناكـەویت، كـاتیك بـەراوردی دەكـات لەگـەڵ ئـەوانیتردا. ئیستاش ئەگەر مردن شـتیكی ئاوەهـا بیـت، مـن دەلیـم مـردن قازانجـە، چونكـە ئیـتر نـەمریی بریتییـە لەتاقـە شەویك. بەلاّم ئەگەر مـردن بریتـی بیت لەگەشتیك بـەرەو شـوینیكی تـر، لـەویش وەكـو خـەلك دەلیـن، هــەموو مردووەكان، پیوەست دەبن بەوەوە كەچاكە، ئۆ هاوریـانم و دادوەران، دەبیـت لەمـە باشـتر چـی بیـت؟ 41aئەگـەر بەراستی كاتیك گەشتیارەكان دەگەنە جیهانی خـوارەوە، رزگاریـان دەبیـت لەپرۆفیسـۆرانی دادپـەروەریی ئـەم جیهانـەو، دادوەرە راسـتەقینەكان دەبیننـەوە، ئەوانـەی كــەدەلین لــەویدا دادوەریــی دەكــەن، مینــۆس• و

---

• مینۆس Minos لەمیتۆلۆجیای یۆنانییدا، فـەرمانرەوای ئەفسانەیی شاری كرییتە. هەندیك لەنوسەرە كۆنەكان شەش حەوت پادشا بـەم ناوەوە دەناسینن، بەتاییـەتی مینۆسـی پـیر كـە باپـیرەی مینۆسـی



**رادامنتۆس• لەگەڵ ئیکۆس• و تریپیتۆلیمۆس•، هەروەها کورانی تری خوداکان، ئەوانەی لەژیانی خۆیاندا**

---

بچووکە. هەرچۆنیك بیت مینۆس کوری زیۆسی پادشای خوداکان بووە، دایکی شازادە یۆروپا بووە.

• رادامنتۆس **Rhadamanthus** لەمیتۆلۆجیای یۆنانییدا، کوریکی تری زیۆس و ئەوروپایەو برای مینۆسی پادشای کریتە. بەپیی گیرانەوەی هۆمیرۆس، رادامنتۆس لەناو بەهەشتدا ماوەتەوەو نەهاتۆتە سەر زەوی. بەڵام هەندیك ئەفسانەی دواتر دەلین، پیاویکی زۆر بەریز بووە لەبەر دادپەروەریی و پاکیزەییەکەی. رادامنتۆس یەکیکە لەسێ دادوەرەکەی جیهانی ژیرەوە.

• ئیکۆس **Aeacus** لەمیتۆلۆجیای یۆنانییدا، پادشای ئاگینیایە(ئیستا پیی دەوتریت ئادینیا) کوری ئاگینیای حۆرییەو دورگەکەش بەناوی ئەوەوە ناونراوە، زیۆسیش باوکیتی. هیرای هاوسەری زیۆس رقی لەئاگینیا بووەو کارەساتیکی بۆ ناردووەو بەشی زۆری دورگەکەی ویران کردووە. ئیکۆس لەباوکی دەپاریتەوە، تا شارەمیرولەیەك بکات بەمرۆڤ بۆئەوەی شارە ویرانکراوەکەی ئاوەدان بکەنەوە. زیۆس نزاکەی بەدیهیناو توخمیکی مرۆڤی دروستکرد کە ناویان لینرا میرمیدۆنسەکان **Myrmidons**. ئیکیۆسیش دادپەروەرانە فەرمارەوایی کردن و دوای مردنیشی بوو بەیەکیك لەسێ دادوەرەکەی جیهانی ژیرەوە

• نریبتۆلیمۆس **Triptolemus** لەمیتۆلۆجیای گریکییدا، بریتیە لەیاوەرە ئەسلییەکەی خوداوەندی دیمیتەری **Demeter** قۆچ زیرین،



سەرراست بوون، بەجۆریکی وەها کەئیتر کردنی ئەم گەشتە شتیکی زۆر باش بیت. مرۆڤ چی نابەخشیت ئەگەر هەلی ئەوەی بۆ برەخسیت لەگەڵ ئۆرفیۆس• و میسۆس و هیسیۆد• و هۆمیرۆسدا• 41bبدویت؟ نەخیر،

---

هەروەها داهینەری نهینییە ئیلۆسینییەکانە کەلەئاهەنگی شکۆدارکردنی دیمیتەردا نمایش دەکریت. تریپتۆلیمۆس کوری پادشا کیلیۆس ئیلیۆسییەو شوانی میگەلەکەی باوکی بووە. رۆژیکیان پیرسیفۆنی Persephone کچی دیمیتەر دەبینیت، کەهیدزی Hades خوداوەندی جیهانی ژیرەوە فراندویەتی و خستویەتە ناو گالیسکەکەیەوە. رزگاری دەکات و دەیگەرشینیتەوە بۆ دایکی، ئەویش لەپاداشتدا گاسنی تەختەو تۆوی گەنمەشامی پیدەدات و دەینیریت تا مرۆڤەکان فیری هونەری کشتوکاڵ بکات. هەروەها فیری ئەو سروتەشی دەکات کە دواتر دەبیت بەنیودارترین سرووتی ئاینیی گریکەکان.

• ئۆرفیۆس Orpheus لەمیتۆلۆجیای یۆنانییدا، بریتیە لەشاعیریك و مۆسیقاژەنیکی دلتەر، کوری ئەپۆلۆی خوداوەندی مۆسیقاو کالیۆپی پەری سرووشە، هەندیك دەلین ئۆیاگرۆسی پادشای سیراس باوکیتی. ئەپۆلۆ سازیکی پیداوەو بووە بەو مۆسیقاژەنە نیودارەی کە لەنیوانی مرۆڤی فانییدا هاوتای نیە.

• هیسیۆد Hesiod لەسەدەی هەشتەمی پیش زاییندا ژیاوە. شاعیریکی گریکییەو لەلای گریکەکان پایەیەکی زۆر تایبەتی هەیە،

**ئەگەر ئەمە راست بێت، بامن هەر بمرم و بمرمەوە. من خۆم، دیسان، بەگەیشتنم بەوانەو ئاخاوتنم لەگەڵ پالامیدیسدا•، هەروەها ئەجاکسی کوری تالامۆن•،**

---

هەم لەبەر تیروانینە ئاکارییەکانی و هەم لەبەر دەنگە خۆشەکەی.

هیسیۆد لەئاسکرای بۆیتیا لەدایك بووە( ئیستا پێی دەوتریت پالایۆپاناگیا). دوای مردنی باوکی دەبێت بەشوان و ژیانی ناوکیلگە تاقی دەکاتەوە. جگە لەشیعرەکانی شتیکی ئەوتۆ دەربارەی ژیانی تایبەتی نازانین. هەندیك قوتابخانەی ئەدەبیی هاوچەرخ بەهاوکاتی هۆمیرۆس لەقەلەمی دەدەن. یەکەمین هۆنراوەی بریتیە لە رەچەلەکی خوداوەندەکان، کەتییدا باسی چەند خوداوەندیك دەکات کە لەهۆمیرۆسدا ناویان نەهاتووە

• **هۆمیرۆس** Homer نوسەری هەردوو شاکاری نیوداری ئەلیادەو ئۆدیسەیە Iliad and the Odyssey ، دوو داستانە سەرەکییەکەی ئەدەبی یۆنانیی. دەربارەی خودی خۆی هیچ زانیارییەك لەبەردەستدا نیە، لەراستیدا تا ئیستاش ئەوە جیگەی مشتومرە ئایا ئەو دوو داستانە یەك کەس نوسیونی یان چەند کەسیك. هەرچۆنیك بیت بروا وایە کە لەدەوروبەری سەدەی هەشتەمی پیش زاییندا ، لە نیشتەجیی یۆنان لەئاسیای بچووکدا، ئەو دوو داستانە بیستراون.

• پالامیدس Palamedes لەمیتۆلۆجیای یۆنانییدا، داهینەری نوسینە، ئەم ئەوەی خستە روو کە ئۆدیسیۆس Odysseus بەدرۆوە خۆی شیت کردووە بۆئەوەی نەیەن بۆ جەنگەکەی تەروادە.

**هـەروەها هــەر پالــەوانیکی دیرینــی تــر کــە بــەهۆی دادوەرییــەکی نادادپەروەرانــەوە مــەرگیان چەشــتووە، خۆشـییەکی دلگـیرم دەسـت دەکـەویت .. بـەبروای مـن، ئەوە خۆشـییەکی کـەم نیـە کـاتیك مـن ئازارەکـانی خـۆم بەوەی ئەوان بـەراورد دەکـەم. لەسـەرووی هەمووشـیەوە، دەتـوانم بـەردەوام ببـم لەسـەر گەرانەکـەم بـەدوای زانینـی چاکــەو خراپــەدا، هــەروەکو ئــەم دونیــا، لــەویش هەروادەکەم، بۆم دەردەکەویت کێ  دانایـە، کیش واخۆی**

---

ئۆدیسیۆسیش لەتۆلەی ئەو کارەدا، هەرکە هەلی بۆ رەخسا یەکســەر پالامیدسـی تاوانبـار کـرد بـەوەی کـە ناپاکــە لەگــەلیانداو ســوپای گریکیش هەتا مردنی بەردبارنی دەکەن.

* ئــەجاکس Ajax لــەمیتۆلۆجیای گریکییــدا، ســەربازیکی بــەهیزە لەشـەری تـەروادەدا بەشـداریی کـردووە. کـوری تیلامۆنـی پادشــای سالامیس بووەوسەرکردەی هیزەکانی سالامیس بووە  لـەو شـەرەدا. پیاویکی زەبـەللاحی دزیـو بـووەو لەقسـەکردندا خـاووخلیچك بـووە، بەلام لەشەردا نەبەردو نەلەرزیو بـووە. لەشـەرەکەدا تـوورە دەبیـت لەبەرئەوەی قەلغانەکەی ئەشیلی  کـوژراوی نادەنـێ و ئـەویش بریـار دەدات ئاگامــەمنونی ســەرکردەی هیزەکــان و مینلاوســی براشــی بکوژیــت. بــەلام ئەســینای خوداوەنــد شــیتی دەکــات ، ئــەویش لەحالـەتیکی شـیتییدا خـۆی دەدات بەسـەر شمشــیرەکەیداو خــۆی دەکوژیت.

**دەردەخات کەدانایە، بەڵام وانیە. پیاو چی نابەخشیت، ئـۆ دادوەرینـە، بۆئـەوەی بتوانیـت سـەرکردەی هەلمەتـە مەزنەکـەی تـەروادە تاقیبکاتـەوە، یـان 41cئۆدیسـیۆس• و سیسیفۆس•، یاخود ئەوانیتر کە لەژمارە نایەن، پیاوان و ژنـانیش! چـەند شـادییەکی بیسـنور دەبیـت لـەوێ دەمەتەقێ لەگەڵ ئەواندا بکەیت و پرسیاریان لی بکەیت! بەواتەیەکی تر، ئەوانە مرۆڤ بەرەو مەرگ رەوانە ناکەن، تەنیا لەبەر ئەوەی پرسیار دەکات: بەدلنیایی نا. چونکە**

---

• ئۆدیسیۆس Odysseus لەئەفسانەی گریکییدا، پاڵەوانیکی یۆنانییە، فەرمانرەوای دورگەی ئیساکا بووەو یەکیکیش بووە لەسەرکردەکانی سـوپای یۆنـان لەهیرشـەکەیدا بۆسـەر تـەروادە. هۆمـیرۆس لـە ئۆدیسـەکەیدا باسـی موغامـەرەکانی ئۆدیسـیۆس دەکـات لـەکاتی گەرانەوەیدا بـۆ وڵات دوای تـەواوبوونی شـەرەکەو دەسـالی رەبـەقی پیدەچیت.

• سیسیفۆس Sisyphus لەمیتۆلۆجیای گریکییدا، پادشای کۆرینسـە، کوری ئیلیۆسی پادشای سیسیلییە. سیسـفۆس چـاوی لیدەبیت کـە زیـۆس ئـەیگینیای کـچ دەفرینیـت و بـۆ باوکەکـەی دەگیریتـەوە. زیۆسیش لە تۆڵـەی ئـەو دووزمانییـەدا، رەوانـەی ناوچـەی تۆروسـی دەکات، لەویش ژیانی نەمریی بەسـەردا دەبرریـت دەبیـت هەمیشـە بـەردیك بـەرەو لوتکـی شـاخیك سـەربخاتە سـەرەوە، بـەڵام دواتـر بەردەکە تل دەبۆوە بۆ خوارەوە.



لەپال ئەوەدا کەزۆر لیرە کامەرانتر دەبن، ئەوانە نەمریش دەبن، ئەگەر ئەوەی دەیلین راست بیت.

بۆیـە، ئـۆ دادوەرینـە، دلتـان بـەمردن خـۆش بیـت، بـەدلنیایی بزانـن کـەهیچ 41dخراپەیـەك بەسـەر پیـاوی باشدا نایـەت، نەلـەژیاندا یـان دوای مردنیـش. ئـەویش و کردەوەکانیشی لەلایەنی خوداکانەوە پشتگوێ ناخرین، فرسـەتەکەی منیـش بـۆ نزیکبوونـەوە لـەکۆتایی، هـەروا لەخۆیەوە نەهاتۆتە پیشەوە. بەلکو من بەروونی دەبینم کەسات و وەختم هاتۆتە پیشـەوە، لەوکاتـەدا کـە بۆمـن واباشترە بمرم و لەچەرمەسەریی رزگارم ببیت، چونکـە سـرووش هیـچ نیشـانەیەکی پیشـان نەداوەنـەداوە. هەروەها لەبەر هەمان هۆش من تورە نیم لەتاوانبارەکانم، یـاخود ئەوانـەی تاوانەکـەیان دایـە پـالم، ئـەوان هیـچ خراپەیـەکیان لەگـەڵ منـدا نـەکردووە، هـەروەها مەبەستیشـیان لەوەنـەبووە کـە هیـچ چاکەیـەکم لەگـەلدا بکەن، بۆ ئەمەش من بەنەرمیی گلەییان لیدەکەم.

41eئایا دەشـیت داوای چاکەیـەکیان لیبکـەم. کـاتیك کورەکانم گەورە دەبن، داواتـان لیدەکەم، ئۆ هاوریکانم، سزایان بدەن، من حەزدەکەم توشی کیشەیان بکەن، وەك چـۆن مـن ئیـوەم تووشـی کیشـە کـرد، ئەگـەر ئـەوان وادیـاربوون کـە بایـەخ بـدەن بەدەولەمـەندیی، یـان



بەهەرشتیکی تر، زیاتر لەوەی بایەخ بەچاکە بدەن، یاخود ئەگەر خۆیان وادەرخست کە شتیك بن، 42aلەکاتیکدا بەراستی هیچ نەبن.. ئیوەش لۆمەیان بکەن، وەك چۆن من لۆمەی ئیوەم کردووە، لەبەرئەوەی بایەخیان بەوشتە نەداوە کەدەبوو بایەخی پیبدەن، ئەگەر وایان زانی کەشتیکن، لەکاتیکدا بەراستی هیچ نەبن. ئەگەر ئیوە واتان کرد، منیش و کورەکانیشم، لەسەردەستی ئیوە دادپەروەریمان پیبراوە.

ساتەوەختی جیهیشتن گەیشتە جێ ئیمەش بەریی خۆماندا دەرۆین.. من بۆ مردن، ئیوەش بۆ ژیان. کەتەنیا خودا دەزانیت کامیان باشترە.